حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ عێراق

وەزارەتی پەروەردە

بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# جوگرافیای گشتی

## بۆ پۆلی دەیەمی وێژەیی

دانانی

د. صبري فـــــارس الهيتي
علي عبدالامير عبود العبادي
فيصل نجم الدين الاطرقجي
باسم عبدالحسين جـــــواد

گۆڕینی

د. احسان عبدالكريم فؤاد
عثمـــــان علي قـــــادر
فـــؤاد حـــەمە خورشيد
كمـــــال غەمبـــــار

چاپی پازدەهەم

٢٧١٦ کوردی – ٢٠١٦ زاینی – ١٤٣٧ کۆچی

# بەشی یەکەم

## جوگرافیا و هۆیەکانی ڕوونکردەوەی زانیاریەکان

### زانیاری جوگرافیا:

لەم ساڵانەی دواییدا مەیدانەکانی لێکۆڵینەوە وبوارەکانی پەرەسەندنی زانستی جوگرافیا پێشکەوتن،وڕای تازەی ئەوتۆش هاتەئاراوە کە لە پەیوەندیە جێگاکردەکان بە شێوەیەکی قووڵتر دەکۆڵێتەوە، وەك لە جاران، ڕەهەندی تازەی ئەوتۆش پەیدابوو کە تێڕوانینێکی گشتگیری پێوەدیارە، ئەمە جگە لە بوونی تێڕوانینی پسپۆرایەتیەکەش .

بیرکردنەوەی تازەی جوگرافیناس ئێستا وەك جاران نییە کە هەر بە ووشکی لەهەرێم یان جێگایەك بکۆڵێتەوە،بەڵکو بایەخ بە لێکۆڵینەوەی دینامیکی دیاردە جوگرافییەکانی هەرجێگایەك دەدا کە سروشتیان لە تازەبوونەوە وگۆڕاندایە. ئێستا،جوگرافیای تازە هەرئەوە نییە کە تەنیا وەسفی ڕووی زەوی ودیاردە جیاوازە سروشتی ومرۆییەکانی بکات، بەڵکو بایەخ بە لێکۆڵینەوەی هەموو وێکچوون و وێکنەچوونێکیش دەدات کە لەسەر ڕووی زەمیندا هەیە وئەو هۆیانەش ڕوون دەکاتەوە کە ئەوەیان هێناوەتە ئاراوە، کەهەندێك لەوهۆیانە پەیوەندیان بەدیاردەی سروشتییەوە هەیە،وەکو: ڕووی زەوی لە بەرزی ونزمیەکەی و ئاووهەواکەی وڕوەکی خۆرسکی وگیانلەبەرانی،هەندێکی تریشیان دیاردەی مرۆیین،کە بریتین لە چالاکیی ئابووری مرۆڤ ودابەشبوونەکەی وئاستی پێشکەوتنەکەی،

جوگرافیای تازە بەلێکدانەوەیەکی زانستیانە لەهەموو ئەودیاردانە دەکۆڵێتەوە.

جوگرافیناس، کە لەناوچەیەکی چیایی دەکۆڵێتەوە، دەیەوێ بزانێت کاریگەری چیاکان چییە لە سەر ئاووهەوا و،لەسەر ڕووەك و لەوەڕی ئاژەڵ و کانزاکاری و بەدەستهێنانی ووزەی کارەبا وڕێگاوبانی هاتوچۆ وسنووری رامیاری نێوان ولآتان و، شێوازی ژیان لەو ناوچەیە بە بەبەراورد بە شێوازی ژیان لە دەشتاییەکان، وپاشان کاریگەری ئەو چیایانە بەسەر جموجۆڵ و کۆچکردنی گەلان ودابەشبوونی نەژادەکان وجیاوازی زمان وديالێکتەکان. ئەم جۆرە لێکۆڵینەوە زانستیانە کە شوێنکار لە هۆکارەوە دەیدۆزێتەوەو، ئەنجامەکەشی لە بنەماکانیەوە دەزانێت، تەنیا لە زانیاریی جوگرافیادا هەیە" کە هەموو دیاردە سروشتیەکانی ڕووی زەوی لە یەك جێگەدا، کۆدەکاتەوە و کارلێککردنی نێوان ئەوان و نێوان ژیانی مرۆڤ دەستنیشان دەکات. لەمەوە ئەوەمان بۆدەرکەوت کە جوگرافیا زانستێکی فراوانی پەیوەندیەکانەو ڕێبازێکی زانستیانەی سەربەخۆی هەیە و لەگەڵ زۆربەی زانستەکانی تردا پەیوەستەو، بەوەش لەگەڵ زانستەکانی تردا هاوشانە کە بەدوای هۆکارەکان دا دەگەڕێ و هەرتەنها بەوە قاییل نییە ڕاستیەکان قبوڵ بکات و وەك خۆی بیانهێڵتەوە. جا بۆئەوەی جوگرافیا شێوەیەکی ڕوونی ئەو (ژینگە)یە بە فراوانی بکێشێت کە مرۆڤی تێدا دەژی " پرسیارێکی زۆر لەمەڕ دیاردەی جۆراوجۆری سروشتی ومرۆییەوە دەپرسێت وهەوڵی ئەوەش دەدات وەلآمەکان بداتەوە.

## لقەکانی جوگرافیا:

ئەوەمان زانی کە **جوگرافیا** زانستێکە لەدیاردە سروشتی و مرۆییەکانی سەر ڕووی زەمین دەکۆڵێتەوە ،و وێکچون و وێکنەچوونی ئەو دیاردانە ئاشکرا دەکات وهۆیەکانیان ڕووندەکاتەوە. لەبەرئەوەجوگرافیا دووجۆرە لێکۆڵینەوە دەگرێتەوە، یەکەمیان لێکۆڵینەوەی دیاردە سروشتییەکانە کە پێی دەڵێن جوگرافیای سروشتی ودووەمیان لێکۆڵینەوەی دیاردە مرۆییەکانە کە پێی دەوترێت جوگرافیای مرۆیی. هەرچەندە لەنێوان ئەم دوو لێکۆڵینەوەیەدا پەیوەندی هەیە بەڵام هەندێ جیاوازیی بنەڕەتی وبابەتی لە نێوانیاندا هەیە،وا لە خوارەوەش هەردوو جۆرەکەیان ڕوون دەکەینەوە:

### ١- جوگرافیای سروشتی:

لە هەموو دیاردەیەکی سەر ڕووی زەمین دەکۆڵێتەوە کە مرۆڤ نەبۆتە هۆی ڕوودان و پێکهێنان و بڵاوبوونەوەیان،بەڵکو چەند هۆیەکی سروشتی بونەتە دروست بوونی ئەم دیاردانەی کە لە شوێنە جیا جیاکانی سەر ڕووی زەمین دەیانبینین . ئەم جۆرە جوگرافیایە دەکرێت بەم چوار بەشەی خوارەوە:

#### أ- جوگرافیای بەرزیو نزمیی ڕووی زەوی(جیۆمۆرفۆلۆجی):

ئەمە لێکۆڵینەوەی شێوەکانی ڕووی زەمین دەگرێتەوە وەکو پێکهاتەی زنجیرەچیاکان و هەموو جۆرە دەشت و گرد و بان و دۆڵ و کەناری دەریاکان و دیاردەکانی تر.

### ب– جوگرافیای ئاووهەوا:

ئەم جۆرەیان لەڕەگەزەکانی ئاووهەوا دەکۆڵێتەوە کەبریتین لە پلەکانی گەرمیو پەستانی هەواو بایەکان و داباری (تساقط)، کە ئایا لە کاتێکەوە تا کاتێکی تر و لەجێگایەکەوە تاجێگایەکی تر جیاوازیان چییەلەسەر ڕووی زەویو هۆی ئەو جیاوازیانە چییەو ئەنجامیان چ دەبێت وپەیوەندییان بە دیاردە سروشتییەکانی ترەوە چییەو، پەیوەندیشیان بە بڵاوبونەوەو نیشتەجێبوونی ئادەمیزاد وبەچالاکیە جۆرەبەجۆرەکانیەوە چییە؟

### جـ– جوگرافیای دەریا و زەریاکان:

ئەمەیان لە دەریا و زەریا وکەنداوەکان و دابەشبوونیان دەکۆڵێتەوە ،لەگەڵ ئەو سامانە کانزاییە و ڕووەکییەو ئاژەڵیەی کە تێیاندا هەن، هەروەها لە تەوژمەئاوەکان وکارکردنیان لەئاووهەواودیاردەی تری سروشتی دەکۆڵێتەوە.

### د– جوگرافیای زیندەوانی:

ئەمەش لە هەموو جۆرەکانی ڕووەك و ئاژەڵ دەکۆڵێتەوە کە چۆن چۆنی بەسەر ڕووی ئەم زەمینەدا دابەشبوون و هۆی جیاوازیان چییە؟ وەکو دارستانی چڕ و گیای کورت و ڕووەکی دڕکاوی، هەروەهاش لە دابەشبوونی سامانی ئاژەڵی کێوی و هۆی جیاوازی وێکنەچوونیشیان دەکۆڵێتەوە.

## ٢- جوگرافیای مرۆیی:

له ئادەمیزاد و کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی سەر ڕووی زەمین دەکۆڵێتەوە، که چۆن پەیدابوون و بڵاوبوونەتەوە چۆن نیشتەجێ بوون و ئارامیان گرتووە، چالاکیی ئابوورییان چیه و ئەم چالاکییەیان چۆن لەگەڵ ژینگەی سروشتی وەکو ئاووهەوا و بەرزی و نزمی زەویدا خۆی گونجاندووە و ئاوێتەبووە؟
ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەش دیسان چەند لقێکی لێ بۆتەوە، کەئەمانەن:

### أ- جوگرافیای ئابووری:

له دابەشبوونی لێرە ولەوێی چالاکیی ئابووری مرۆیی دەکۆڵێتەوە لەسەر ڕووی ئەم زەمینە ولەگەڵ ئەوهۆکارانەی که هانی ئەم شێوە دابەشبونەیان داوە،کەئەمەش جوگرافیای کشتوکاڵی وپیشەسازی وجوگرافیای وەبەرهێنانی دەرامەتی سروشتی و هی بازرگانی وگواستنەوەش دەگرێتەوە.

### ب- جوگرافیای دانیشتوان (السكان):

لەدانیشتوان دەکۆڵێتەوە بەگوێرەی ژمارەوپێکهاتەی تەمەنیان وپلەی ئابورییان و زۆربوون وچڕیان (كثافتهم)ودابەشبوون وپێکهاتەی نێرومێ یان.

### جـ- جوگرافیای نیشتەجێبوون (الاستيطان):

له مۆڵگەکانی نیشتەجێبوونی مرۆیی دەکۆڵێتەوە له گوند و شارەکاندا. نیشتەجێبوونی گوندەکان بایەخ بە دابەشکردنی مۆڵگەی گوندەکان و

چالاکیەکانی دانیشتوانیان و پەیوەندییان لەگەڵ نشینگە (مستوطنات) دراوسێکانیان دەدات . بەڵام نیشتەجێبوونی شارەکان لە چالاکیە جۆربەجۆرەکانی دانیشتوان دەکۆڵێتەوە لەگەڵ ئەرك و فرمانی هەریەکەیان، پیشەسازی بێت یان بازرگانی وە لە پەیوەندیی نێوان شارەکان و نێوان شارێك و ناوچەکانی دەوروبەریشی دەکۆڵێتەوە، لەگەڵ پێکهاتەی ناوەوەی شارەکان و مۆرفۆلۆجیشیان.

### د- جوگرافیای ڕامیاری:

لە یەکە ڕامیارییەکانی ئەم جیهانە دەکۆڵێتەوە، لەگەڵ ئەوکێشانەی کە دووچاریان دەبێتەوە لەژێر رۆشنایی بنەما سروشتی و مرۆیی و ئابووری و بنەماکانی تری کەلەسەری دامەزراون، لەگەڵ ئەو پەیوەندیانەی کەبەیەکەوەیان دەبەستێتەوە ولایەنی تری رامیاری .

### هـ- جوگرافیای سەربازی:

لەهەموو بنەماکانی جوگرافیای سروشتی ومرۆیی دەکۆڵێتەوە کە پەیوەندی بە دانانی پلانی سەربازیەوە هەبێت، وەکو زانین وشارەزابوونی سروشتی ڕووی زەوی لەچیاوبان ودەشت ودۆڵ ودەریاچەوزەلکاوەکان لەگەڵ زانینی دەرامەتی ئابووری ئەم جۆرە جێگایانە، چونکە ئەمانە کار لە جوڵەو وچالاکیی سەربازی وئامادەکردنی خۆراك وپێداویستیەکانی تر دەکەن.

جگە لەوانەی سەرەوە چەند لقێکی جوگرافیای تریش هەن. لەمانە:

## ٣- جوگرافیای مێژوویی:

ئەم جۆرە جوگرافیایە لە دیاردەی سروشتی و مرۆیی ڕابردوو دەکۆڵێتەوە، وەك دیاردەی بەرز و نزمی ڕووی زەوی و دەریا و زەریاکان و بارودۆخی ئاووهەوا و ڕووەکی سروشتی و گیانلەبەران، هەروەها لە جیاوازی وێکنەچوونی چالاکییە ئابوورییەکانی مرۆیی هەر سەدەیەکی مێژووییش دەکۆڵێتەوە.

## ٤- جوگرافیای هەرێمی:

بریتییە لە لێکۆڵینەوەی بەشێکی (ڕووبەرێکی دیاریکراوی) سەر ڕووی زەمین کە تایبەتمەندی سروشتی و مرۆیی خۆی هەیە ولە هەرێمەکانی تری دراوسێی ناچێت، مەبەستیشمان ئەوەنییە کە هەرێمی تری وەکو ئەمە لەجیهاندا نەبێت.

ئەو دیاردانەی باسکران سروشتی بن یان مرۆیی بنچینەوبناغەیەکن بۆ لێکۆڵینەوەی هەر پارچەیەکی سەر ڕووی زەمین لەلایەن جوگرافیناس ، تەنیا ئەوەندە هەیە لەو دیاردانە بکۆڵێتەوە و دابەشیان بکات و پەیوەندی نێوانیان بدۆزێتەوە، پێویستیشە نەخشە بکاربهێنێت چونکە نەخشە ئامرازێکی گرنگی جوگرافیناسەو و بەبێ نەخشە دەورێکی ڕاستەقینەی نابێت.

## بایەخی زانیارییە جوگرافییەکان:

لەو ڕونکردنەوانەی کە خوێندمان ئەوەمان بۆدەرکەوت کە زانستی جوگرافیا پەیوەندیی توندی بە هەموو زانستەکانی تری وەکو ڕووپێو و نەخشەو جیۆلۆجیا و زانینی ئاووهەواو ڕووەك و گیانلەبەر و گەردووناسی و ئابووری و ئەندازە و کۆمەڵناسی و ڕامیاری و مێژوو و زانستی ترەوە هەیە. سەرەڕای ئەم پەیوەندیە بەهێزەی نێوان جوگرافیا و زانستەکانی تر کەچی هێشتا ڕێبازی سەربەخۆی خۆی هەیە، دەبینین لەو کارلێککردنە دەکۆڵێتەوە کە لە نێوان مرۆڤ و ژینگەکەیدا هەیە و تا چەند ئەو دوانە کاریان لەیەکتر کردووە. کاتێك جوگرافیا بایەخ بە لێکۆڵینەوەی زەوی و ڕوواڵەتەکانی و ،بە ئاووهەوا و دیاردەکانی و، بە ڕووەك و سیفەتەکانی و هەلومەرجەکانی ڕووان وشینبوونی دەدات، لەبەرئەوەیە کە مرۆڤ لەو بوارانەدا چالاکیی جۆربەجۆری خۆی ئەنجامدەدات، پێویستیشە لە هەموو گۆڕانێك بگات کە کار لەو بوارانە دەکات، سا ئەو گۆڕانانە سروشتی بن یان دەستکردی مرۆڤ بن.

لە بواری سروشتیدا، بۆ نموونە، تێگەیشتنی شێوەکان و دیاردەکانی ڕووی زەوی و کارکردنی مرۆڤ لە ژینگەی سروشتی، وەهای لێکرد کە چاکترین ڕێگا بگرێتەبەر بۆ وەبەرهێنانی زەوی ودەرامەتی زەوی وپاراستنی ڕەگەزەکانی کە بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیە لە پاراستنی خاك لە ڕامالین و ڕزگارکردنی لە شۆرەکات وگەڕاندنەوەی بەپیتی خاك. هەرلەبواری سروشتیدا زانایانی جوگرافیا لێکۆڵینەوەیان لەمەڕ دەستبەسەرداگرتنی دەرامەتی ئاوو چەندێتی ئاو بە پرۆژەی ئاودێری ئەنجام دا، سەرەڕای

ئەوەش بۆ زانینی چەندێتی بارانیش لە هەلومەرجی ئاووهەوایان کۆڵیەوە و پلەکانی گەرمییان لێکدایەوە،کە ئەم بنەمایانەش یارمەتیمان دەدەن بۆزانینی هۆکارەکانی پێشخستنی چالاکی کشتوکاڵی .

جوگرافیناس لەبواری جوگرافیای مرۆیی دا هەوڵی ئەوەدەدات کە جێگایەکی لەبار بۆ دامەزراندنی کارگە بدۆزێتەوە، چونکە ئەو لە کەسانی تر ئەو جێگەیە باشتر دەستنیشان دەکات.

جوگرافیناس دەست لە بواری هێلکاری نیشتەجێکردنی گوندی و شاریش دەدات لە برگەکانی شارو جۆری تایبەتمەندی فرمانەکانی و وەبەرهێنانی زەویەکانیشی دەکۆڵێتەوە، سا ئەو وەبەرهێنانە پیشەسازی، بازرگانی، نیشتەجێبوون بێت یان هی رابواردن، ئەمەش لە سازدانی هێلکاری گشتی شاردا کەلکی خۆی بەخشیوە. دەوڵەتە گەورەکانیش کە بە هۆی مانگی دەستکردەوە وێنەی کارگە و بنکەی سەربازی و سروشتی زەوی و دابەشبوونی دانیشتوانی دەوڵەتەکانی دژ بەخۆیان دەگرن. ئەمەش باشترین بەڵگەیە کە زانیاری و شارەزایی جوکرافیایی بایەخی هەیە و گرنگە

## بەشی دووەم

### سەرەتای نەخشەوانی و لێکۆڵینەوەی دیتنکاری(مەیدانی)

### پێناسەی ڕەگەزەکانی نەخشە:

نەخشە گرنگترین هۆی بەچاوبینراوی فێرکردنە کە بەهۆی وێنە و هێماکانی ناویانەوە هەموو دیاردەیەکی سروشتی ومرۆیی سەر زەوی بە ئاسانی دەخوێنرێتەوە وشارەزایان دەبین، نەخشە ئامرازێکە پەیوەندی جێگاکردی ئەو دیاردانە لە هەر پارچەیەك لە پارچەکانی سەر رووی زەوی بە روونی دەخاتەروو، ئێمە ئەگەر بەچاو هەرچەند بۆمان بکرێت سەیری ناوچەیەکی زەوی بکەین دەتوانین تەنیا لەو ماوەیەدا کە چاوبڕبکات شارەزای هەندێك دیاردەی ڕووبەرێکی زۆر کەم ببین، بەڵام نەخشە چەندی بچوکیش بێت دەیەها ئەوەندەی چاومان بڕبکا وچەنددیاردەیەکی ناوچەیەکی زۆر فراوانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە. پێشکەوتنی نەخشەکێشان و پەرەسەندنی ئامرازەکانی نەخشەکێشان خودی نەخشەکانی زیاتر ڕوونکردەوە وزانیاریەکانی ناویانیشی چڕتر کرد ونەخشە وای لێهات کە بتوانێت پەیوەندی نێوان دیاردە جۆراوجۆرەکانی جوگرافیا بخاتەبەرچاو، بۆیە نەخشە لەهەموو لێکۆڵینەوەیەکی جوگرافی و مەرامی تری ئاشتی و جەنگیشدا بایەخی دوو ئەوەندە زیاتر بووە. جا بۆ ئەوەی بە ووردی لە نەخشە بگەین پێویستە شارەزای هەموو ڕەگەزە گرنگەکانی ببین کە بریتین لە: ناونیشان، پێوەری نەخشە، ئاراستەکان و زاراوەکانی تری.

## ناونیشانی نەخشە:

لەبەرئەوەی نەخشە بۆ ئەوە دەكێشرێت كە دیاردە و زانیاری جوگرافی و مەرامەكانیتری نیشان بدات" وا پێویست دەكات كە هەر نەخشەیەك بۆ بابەتێكی دیاری كراو بێت و تایبەت بۆ دەربڕینی كۆمەڵە دیاردەیەكی دیاریكراوی جوگرافی بكێشرێت و هی ناوچەیەكی دیاریكراوی سەر ڕووی زەمین بێت، بۆیە هەر نەخشەیەك ناونیشانی تایبەتی خۆی هەیە تا لەگەڵ ئەو نەخشانە تێكەڵ نەبێت كە تایبەتن بە بابەتی ترەوە، بە نموونە دەڵێین، ئەمە نەخشەی بەرزی و نزمی سەر ڕووی زەمینە، ئەوەیان نەخشەی (مامناوەندی بارانی ساڵانەیە لە وڵاتی عێراق). ناونیشانی نەخشەكە لە جێگایەكی وادا دەنووسرێت كە بگونجێت و دەبێت بە خەتێكی جوانیش بنووسرێت، پێویستە چوارچێوەی تایبەتی خۆی بۆ بكێشرێت.




نەخشەی چڕی دانیشتوان لە عێراق

دەبێت ئەوەش بزانین کەبە خوێندنەوەی ناونیشانی نەخشە، بیرێکی سەرەتاییمان لەمەڕ بابەتی نەخشەکەوە یان لەمەڕ ئەو کۆمەلە دیاردانەی کە نیشانی دەدات لە مێشکدا پەیدا دەبێت، هەر لەو ناونیشانەوە ئەوەش تێ دەگەین کە نەخشەکە چۆن چۆنی و بەچ شێوازێك ئەو دیاردە و زانیارییانە دەردەبرێت،لەوانەیە دوو نەخشە بکێشرێن و هەردووکیان بابەتی دانیشتوانی عێراق بنوێنن و ناونیشانی یەکەمیان ((نەخشەی چڕی دانیشتوانی عێراق)) بێت هی دووەمیان ((دابەشکردنی دانیشتوانی عێراق بە نزیککراوەیی)).




نەخشەی دابەشکردنی دانیشتوانی عێراق

هەرچەندە ئەم دوو نەخشەیە یەك بابەتن، بەلام شێوازی نواندنی بابەتی یەکەمیان ناوچەکانی دانیشتوان دەنوێنێت بەگوێرەی پلەبەپلەی چڕی دانیشتوان،هەر ناوچەیەکی چڕی دانیشتوانەکەش بەجۆرێك ڕەنگ کراوە کە لەڕەنگی ناوچەکانیتر جیاوازە. کەچی نەخشەی دووەمیان دانیشتوانی عێراقی بە نزیککراوەیی بەسەرهەموو لایەکی عێراقدا دابەشکردووە و بەخاڵ و پەڵەی ڕەنگاوڕەنگ کۆمەڵبوونی دانیشتوانی هەر یەکەو لە جێگەی تەواوی خۆیدا نواندووە . بەو جۆرە ئەودوو نەخشەیە بەپێی جیاوازی ناونیشانیان هەر یەکەیان بەجۆرێك بابەتی دانیشتوانی یەك وڵات دەردەبڕن.وەدەبێ ناونیشانی نەخشە ساڵی ئەوداتاو ڕوونکردنەوانەی تێدابێت بۆئەوەی کرداری بەراوردکردن ئاسان بێت لەکاتی بوونی زیاتر لەیەك نەخشە.

### پێوەری نەخشە:

نەخشە دەبێت ڕووبەرێکی فراوانی زەوی لەسەر کاغەزێکی بچووك بنوێنێت، جا ڕووبەری ئەوکاغەزە یان ئەوشتەی نەخشەکەی لەسەر دەکێشرێت هەرچەندێك گەورە بێت هێشتا هەر لە ڕووبەری ئەو زەوییەی دەینوێنێت زۆر بچووکترە،لەبەرئەوە درێژیی ماوەکانی سەر نەخشەکە کەمترە تا لەوانەی سەر زەوییەکەو، پێویستیشە بزانین کە ماوەکانی سەر نەخشەکە چەندجار کەمترن لەماوە هاوبەرامبەرکانیان لەسەر زەوی، ئەگەر نەخشە ئەوەی نەبێت بەهاونرخی زانستی نییە وبەکارنایەت.بە نموونە،دەریاوان یاخود فڕۆکەوان کە نەخشە بەکاردەهێنن، ئەگەر بێتو نەخشەکەیان ماوەکان نیشان نەدات کە چەند جار کەمترن تا ماوە هاوبەرامبەرەکانیان لەسەر زەوی، ناتوانن

بزانن کە هێشتا چەندیان ماوە بگەنەجێ، بەڵام ئەگەر نەخشەکەیان ڕێژەی بچووککردنەوەی تێدابێت وبزانن کە (١٠٠,٠٠٠)جارلەزەوییەکەی هاوبەرامبەری بچووکتر کراوەتەوە، ئەوسا زانینی هەرماوەیەکی سەرزەویی بوێت ئەو ماوەیە لەسەرنەخشەکە دەپێوێ ولە (١٠٠,٠٠٠)ی دەدات، واتا ماوەکەی سەر نەخشەکە (١٠٠,٠٠٠) جار گەورەتر دەکات و ماوەەی سەر زەوی دەردەچێت، واتا هەرسانتیمەترێکی سەرنەخشەکە، (١٠٠,٠٠٠)سانتیمەتری سەر زەوییەکەیە کە دەکاتە یەك کیلۆمەتر، هەتا ئێستاش وا باوبووە کە نەخشەی ناوچەیەك چەند جار بچووك کرابێتەوە بەو بچوو کردنەویە بڵێن (ڕێژە)، واتە بەپەیوەندی نێوان ماوەکانی سەرنەخشەکە و ماوە هاوبەرامبەرکانیان لەسەر زەوییەکە دەوترێت (ڕێژە)، جاروباریش بە ووشە دەنووسرێت (پێوەری نەخشەکە)، یاخود بە ڕەنووس دەنووسرێت و لە نەخشەکەدا بەم جۆرانەی خوارەوە دەنوێنرێت:

أ- پێوەری نووسراو (ڕاستەوخۆ):

ئەمە ساکارترین جۆری پێوەرەکانی نەخشە کێشانە کە (یەك سانتیمەتری بۆ یەك کیلۆمەتر) تێدا دادەنرێت. واتا ماوەی یەك سانتیمەتری سەر نەخشەکە یەك کیلۆمەتری تەواوی سەر زەوییەکە دەنوێنێت، هەروەها یەك (گرێ)ش بۆ یەك (میل) دادەنرێت. واتا هەر گرێ (ئینجێك)ی سەر نەخشەکە میلێکی سەر زەوییەکە دەنوێنێت.

### ب– پێوەری ژمارەیی (کەرتی):

ئەمەش جارجار بە شێوەی کەرتی ئاسایی دەنووسرێت، سەری کەرتەکە ماوەی سەر نەخشەکە و ژێرەکەشی ماوەی سەر زەوییەکە دەنوێنن، بەم جۆرە : $\frac{١}{١٠٠,٠٠٠}$ واتا هەر سانتیمەترێکی سەر نەخشەکە (١٠٠,٠٠٠) سەنتیمەتری سەر زەوی یەکە دەنوێنێت.

واتا ڕێژەی نێوان ماوەی سەر نەخشەکە لەسەر ماوەی سەر زەوییەکە وەکو ڕێژەی نێوان (یەك و سەد هەزار) وایە، لەبەرئەوە ئەو پەیوەندیەی نێوان ئەو دوو ماوەیە بە شێوەی ڕێژەی (١: ١٠٠,٠٠٠) دەنوسرێت. لەم جۆرە پێوەرەدا پێویستە سەرەی کەرتە ئاساییەکە یەك ژمارە بێت و ژێرەکەشی ژمارەیەکە بە چەند سفرێك دوایی دێت، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بپێورێت و ماوە ڕاستەقینەکانی سەر زەویش بە خێرایی لە نەخشەکەوە وەدەست بێت، هەروەها سەرە و ژێرەش دەبێت یەك جۆرە (یەکە) بنوێنن، واتا ئەگەر سەرە بەسەنتیمەتر نوسرا ژێرەش پێویستە بە سەنتیمەتر بنووسرێت.

### ج– پێوەری هێڵکرد:

ئەمەش ڕاستەهێڵێکە و لە خوارووی نەخشەکەوە بە درێژاییەکی گونجاو دەکێشرێت و دەبێت لە (١٠) سەنتیمەتر درێژتر نەبێت، ئەم هێڵە بە چەند بەشێکی یەکسانەوە دابەش دەکرێت و هەر بەشەش ماوەیەکی دیاریکراوی سەر ڕووی زەوییەکە دەنوێنێت، جا ئەوماوانە میل بن یان کیلۆمەتر، بەشی یەکەمیشی دابەش دەکرێت بەسەرچەند جارەکانیدا یاخودبەسەر پارچەکانیدا کە مەترن یان یاردەن،بە نموونە ئەگەر بمانەوێت پێوەرێکی

هێڵکرد بکێشین کە پێوەری ڕەەنوسکردی (١: ١٠٠,٠٠٠) بنوێنێت، ئەمەش = (١ سەنتیمەتر بەرامبەر ١ کیلۆمەتر)، ئەوا ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەنێین:

١- ڕاستەهێڵێکی گونجاو دەکێشین (با ٦ سم) بێت.

٢- ئنجا ڕاستەهێڵەکە بە هۆی پڕگاڵەوە دەکەین بە شەش بەشەوە، درێژی هەر بەشەیان ١ سم بێت.

٣- لە خاڵەکانی دابەشکردنەوە ئەستوون بەرزدەکەینەوە هەر یەکەیان لە دوو ملیمەتر درێژتر نەبێت، زۆرجاریش پێوەری هێڵکرد بە شێوەی دوو هێڵی هاوتەریب دەکێشرێت،کەلەیەکتریەوە ٣ تا ٤ ملیمەتردووربن وبۆزیادە ڕوونکردنەوەش هەندێ بەشیان ڕەش دەکرێن ونەوانیتر وەك خۆیان دەمێننەوە .

٤- لەسەر هەموو بەشێك ژمارەی ئەو کیلۆمەترانە دەنووسین کە ماوەکانی سەر هێڵەکە دەیان نوێنن و لە سفرەوە دەست پێدەکەن.

ماوەی یەکەم کە (١) سەنتیمەترە کیلۆمەترێك دەنوێنێت و ماوەی دووەم کە دوو سەنتیمەتر درێژە دوو کیلۆمەتر دەنوێنێت..هتد، (واتا ١سم لەسەر نەخشەکە ١ کیلۆمەتری سەر ڕووی زەویەکە دەنوێنێت).

پێورەی هێڵکرد ئەوەی باشە کە بە ئاسانی و گورجانە هەر لە نەخشەکەوە ماوە ڕاستەقینەکانی سەر ڕووی زەویمان بۆ ئاشکرا دەکات بەبێ ئەوەی کە لە ڕێی بیرکارییەوە پێوەی ماندوو ببین، تەنها ئەوەندەی دەوێت ڕاستەیەك یان پارچە مقەبا یان کاغەزێك بێنین و قەراغێکی ڕاستی بخەینەسەر نەخشەکە وماوەی نێوان دوو شاری یان دوو دیاردەی لەسەر نیشانە بکەین،

ئینجا ئەو قەراغە ڕاستەی بەسەر پێوەرە هێلکردەکەدا جووت بکەین بە مەرجێك سەرێکی ماوە نیشانەکراوەکە بکەوێتە سەر خاڵی سفری پێوەرە هێڵکردەکە ئینجا ئەوژمارەیە دەخوێنینەوە کە سەرەکەی تری کەوتۆتە سەر، ئیتر ئەو ژمارەیە ماوەی ڕاستەقینەی نێوان ئەو دوو شارە یان ئەو دوو دیاردەیە لەسەر زەوی[1] .

د- پێوەری تۆڕی

هـ- پێوەری بازنەیی




جۆرەهای پێوەری هێڵکرد

---

[1] دەبێت مامۆستا ئەوجۆرە پێوانەیە لەبەر چاوی قوتابیاندا بکات.

## ئاراستەکان (الاتجاهات):




وێنەیەکە ئاراستەکان نیشان دەدات

چوار قۆڵی زانراو هەیە: باکور یەکێکیانە و پێچەوانەکەشی باشوورە، ڕۆژهەڵاتیش پێچەوانەکەی ڕۆژئاوایە، ئەگەر یەکێك لەم ئاراستانە بزانین ئەوانی ترمان بۆ دەدۆزرێتەوە،چونکە ئەگەر بەرەورووی باکوور بوەستین باشوور دەکەوێتە پشتمانەوە و دەستی ڕاستمان دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵات و دەستی چەپیشمان ڕۆژئاوا نیشاندەدات، بەم چوار قۆڵانەش دەوترێت، چوار ئاراستە سەرەکییەکان، جگە لەوانە لقەقۆڵی تریش هەن کەوتوونەتە نێوان قۆڵە سەرەکییەکانەوە (وەکو لە وێنەکەدا دیاری کراوە).

لەسەر نەخشەکان، لە قەراغێکەوە، نیشانەیەك دەکێشرێت کە ئاراستە سەرەکییەکان نیشان دەدات، دوو تیری یەکتربڕ دەکێشرێن و لەبەر نووکی هەر تیرێکیاندا ئەو قۆڵە دەنووسرێت کە دەینوێنێت، یان تەنیا تیرێك ڕووله

باکوور دەکێشرێت و لەسەر نووکەکەی دەنووسرێت (باکوور) و لەوانەیە ئەوەی لێ نەنووسرێت چونکە لە هەموو نەخشەکەدا ئەو تەنیا تیرە ئاراستەی باکوورە. لەوانەشە هەندێ نەخشە هیچ نیشانەیەکیشی نەبێت کە هەر چوار ئاراستەکان یان باکوور نیشان بدات، لەم بارەدا سەرەوەی نەخشەکە قۆڵی باکوور دەنوێنێت و ئەو لایەشی کە کەوتووتە شانی ڕاستمان ڕۆژهەڵاتە و بەوجۆرە لایەکانی تریش ئاشکرایە.

جا بۆ ئەوەی سوود لە نەخشە وەربگرین پێویستە ئاراستە سەرەکییەکان و ئاراستەکانی تریش شارەزابین. چەند ڕێگایەکیش هەن کە بەهۆیانەوە لەسەر زەوی ئاراستەکانی پێ دەدۆزینەوە، کەئەمانەن:

**(١) بە هۆی قیبلەنما:**

چونکە دەرزییە موگناتیسیەکەی هەمیشە ڕووی لە باکوورە، ئێمەش نیشانەی باکوری سەر نەخشەکە لەگەڵ نووکە باکورییەکەی قیبلەنماکەدا جووت دەکەین.




نیشانکردنی باکوور بەهۆی قیبلەنما

### (٢) بەهۆی سێبەری داردەستێکەوە:

ئەم جۆرەیان لە کاتی نیوەڕۆدا دەبێت واتا (سەعات ١٢ی نیوەڕۆ)، دارەکە بە شێوەیەکی ئەستوونی دەچەقێنرێتە زەوییەکە و لەو کاتەدا سەرنجی سێبەرەکەی دەدرێت کە ئاسایی ڕووی لە باکوورە چونکە ئێمە لە نیوەکەی باکووری گۆی زەویین و (باکوری خولگەی قرژاڵ کەوتووین)، ئەستوونیی ڕۆژیش لەم نیوەگۆیەدا لە هیچ کاتێکدا لە سەر هێڵی خولگەی قرژاڵ تێناپەڕێت و بەجێی ناهێڵێت، لەبەر ئەوە دارەکە سێبەرێك لەسەر زەوییەکەدەکات کە لە بەرایی ڕۆژ و دوادوایی ڕۆژدا درێژ دەبێتەوە، ئەو سێبەرە لە نیوەڕۆی (٢١ی) حوزەیراندا دەگاتە ئەوپەڕی کورتیی (سەیری وێنەکە بکە)،بەڵام لە نیوەکەی باشوری گۆی زەویدا سێبەری دارێك بە پێچەوانەی ئەوەوە ڕوودەکاتە باشوورو، لە (٢١)ی کانونی یەکەمدا دەداتە ئەوپەڕی کورتیی.

نیشانەکردنی باکوور لە نیوەکەی باکووری گۆی زەویدا بەهۆی دارێکەوە

### (٣) بەهۆی ئەستێرە گەشەوە:

دەتوانین ئاراستەی باکوور لە شەوێکی سامالدا بدۆزینەوە، چونکە لە شەوی وادا ئەستێرەکان بە باشی دەبینرێن، ئەو ئەستێرە گەشەی کەوتووەتە دامێنی کلکەی حەوتەوانە بچکۆلەوە (الدب الاصغر) ئەوە ئەستێرە گەشەیە و لە ئاسماندا جێگەی خۆی ناگۆڕێت چونکە بە ئەستوونی بەسەر جەمسەری باکووری زەمیندا وەستاوە.

دەشتوانین بەهۆی سەرنجدانی کۆمەڵەی حەوتەوانە گەورەکەوە(الدب الاکبر)، بیدۆزینەوە، کە لەبەردەم ئەم کۆمەڵەیەدا دوو ئەستێرە هەن پێیان دەووترێت (المشیران) کە ئەگەر هێڵێکی خەیاڵکرد لە نێوان ئەم دوو ئەستێرەیەدا بکێشین کلکەی ئەم هێڵە جێگەی ئەستێرە گەشە نیشاندەدات، ئەستێرە گەشە ئەستێرەیەکی پرشنگدارە بەسەر جەمسەری باکوورەوە دەیبینین. (سەیری وێنەکەی بکە).




دۆزینەوەی باکوور بەهۆی ئەستێرە گەشەوە

## کلیلی نەخشە (کلیلی ڕەنگەکان):

ڕەنگاوڕەنگ کردنی نەخشە یەکێکە لەو ڕێگایانەی دیاردە جوگرافییەکانی سەر نەخشەکە ڕوون دەکاتەوە، نەخشە سروشتییەکان کە ڕەنگاوڕەنگ دەکرێن لەبەر ئەوەیە کە ئەو ڕەنگانە لەگەڵ ڕەنگی سروشتی دیاردە خۆڕسك و سروشتیەکاندا نزیکن و دەگونجێن، چونکە ئەگەر لە بەرزییەوە سەیری زەمین بکەین دەبینین کە ڕەنگی بەرزایییەکان قاوەییەکی تێرە یان بنەوشەیی، دەشتاییەکان و نزماییەکانیش زەرد و سەوز دەچنەوە و ئاوەکانیش مەیلەوشینن . لەخوارەوەی نەخشەشدا بەرزاییەکان و نزماییەکان بەڕەنگ پلەپلە نیشان دەکرێن و پێی دەوترێت کلیلی نەخشە. ئەو پلەپلە ڕەنگاوڕەنگە بریتین لە زاراوەکانی نەخشەکە و قوتابی کە نەخشەکە بەکاردێنێ دەبێت بزانێت کە مەبەست لەو زاراوانە چییە. بە نموونە، یەکێك لەم زاراوانە ئاوی دەریا و زەریاکان دەنوێنێ لەبەرئەوە بە شین ڕەنگ دەکرێت، شینەکەشی پلەپلەیەو هەمووی وەك یەك نابێت، چونکە دەریا وزەریا قووڵەکان بەشینێکی تێرتر ڕەنگ دەکرێن، بەڵام تەنکاوەکانیان بە شینێکی کاڵ(کراوە)، واتا قووڵی ئاوەکان هەتا کەمتر بن ڕەنگەکەیان شینێکی کاڵتر دەبێت، بەو جۆرە بەگوێرەی پلەبەپلەی ڕەنگە شینەکە قووڵایی ئاوەکان چەند بن بۆمان ڕوون دەکرێنەوە.

سنووری دەریا و زەریاکانیش بە هێڵی شینی تێر دەکێشرێت و ئەم سنوورە هێڵی بەیەکگەیشتنی ئاوی دەریا و زەریاکانە لەگەڵ ووشکایی و، بریتیە لە هێڵێکی پێچاوپێچ و پێی دەوترێت هێڵی کەناراو (خط الساحل).

بەشی ووشکانییش ڕەنگی تری بۆ دادەنرێت نەك شین، کە بە هۆیانەوە بەرزاییەکانمان بۆ دەردەکەون و پێویستمان بە بەکارهێنانی ژمارە نابێت.

بە نموونە، ئەو زەویانەی لەئاستی ڕووی دەریا نزمترن بە سەوزی تێر(زەیتونی) ڕەنگ دەکرێن ،ئەو زەویانەش کە لە ئاستی ڕووی دەریان و زۆربەرز نین بەسەوزی ئاسایی ڕەنگ دەکرێن،بەلاَم ئەو زەویانەی کەلەئاستی ڕووی دەریا بەرزترن بە سەوزی کالّ(کراوە) ڕەنگ دەکرێن. هەرچەند زەویەکانیش بەرزتر بن (بیابان وبانەکان) بەزەرد ڕەنگ دەکرێن. چیا و بەرزاییەکانیش بە ڕەنگی قاوەیی ڕەنگ دەکرێن و ئەم ڕەنگە پلەبەپلە بە گوێرەی بەرزبوونەوەی زیاتر تۆخ دەکرێت لە قاوەیی کالّ (کراوە) بۆ قاوەییەکی ئاسایی و پاشان بۆ قاوەییەکی تێروتۆخ ،بەلاَم چیا هەرە بەرزەکان ڕەنگی سپی ڕەنگ دەکرێن .

بۆ دیاریکردنی بەرزایی وشکایی ، وقولاَیی دەریاکان، لە خوارووی هەموو نەخشەیەکدا ، خشتەیەکی بچووك دەکێشرێت کە دوو ڕیزە لاکێشەی بچووك بچووکی تێدایە، ڕیزێکیان هی وشکایی و ڕیزەکەی تریان هی دەریاکانە.

لاکێشەکانی ڕیزی یەکەم، بە گوێرەی ڕەنگەکانی وشکایی، هەر لە بەرزیی ڕووی دەریاوە بیگرە پلەپلە بەرەو بەرزتر، چ ڕەنگێ بنوێنن بەو ڕەنگە ڕەنگ دەکرێ، و لەشان هەر لاکێشەیەکیشەوە چەند بەرز بنوێنێ لەڕووی دەریاوە،ئەو بەرزییە بەژمارە دەنووسرێت.لاکێشەکانی ڕیزی دووەمیش یەکەیەکە و پلەپلە بەڕەنگی شینی کالّ هەرلە ڕووی دەریاوە بیگرە بەرەو قولّتر شینەکانی تێر تر دەکرێ، و هەر لاکێشەیەکیشیان چ قولاّییەك بنوێنێت

له شانییەوە دەنووسرێت.ئەم خشتە بچوکە کە بەرزایی و قوڵایی دیاردەکانی نەخشەکە ڕووندەکەنەوە،پێی دەوترێت(کلیلی ڕەنگەکان)،هەروەها کلیلی نەخشە بۆ دابەش بوونی کانزاکان وپیشەسازی وکشتوکاڵ وشوێنەوارەکان وگەشتوگوزارودانیشتوانیش بەکاردێت لەسەر نەخشە.




نەخشەی سروشتی عێراق

## جۆرەكانی نەخشە

نەخشە هۆیەكی گرنگە وبەبێ نەخشە لە جوگرافیا ناكۆڵرێتەوە، نەخشە چەند جۆرێكە و هەریەكەشیان دیاردەیەك یان كۆمەڵە دیاردەیەكی سروشتی یان مرۆیی دەنوێنێت و گرنگەكانیان ئەمانەن:

١- نەخشە سروشتیەكان، ئەمانەن:

أ- نەخشەكانی بەرزی و نزمی زەوی:

ئەمانە شێوەكانی بەرزی ونزمی ڕووی گۆی زەمین دەردەبڕن كە سێبەردار و ڕەنگاوڕەنگ دەكرێن، ئەم سێبەر وڕەنگانەش سوودیان ئەوەیە كە هەموو جۆرە زەوییەكی چیایی و زورگان و بان و دەشت و ئاوەڕۆی ڕووبارەكان و جۆری كەناراوەكان و دیاردەكانی تر جیاجیا ئاشكرا دەكەن. (وەكو لە كلیلی ڕەنگەكاندا ڕوونكراوەتەوە).

ب- نەخشەكانی ئاووهەوا:

ئەم نەخشانە دیاردەكانی ئاووهەوای سەر گۆی زەوی نیشان دەدەن یان بەشێكیان دەردەبڕن، وەكو پلەكانی گەرمی و پەستانی هەوا (جەو) و ئاراستەكانی (با)و، شێ و باران، ئەم جۆرە نەخشانە ئاسایی بۆ ڕوونكردنەوەی تێكڕای ساڵانەی ئەو جۆرە دیاردە ئاووهەوایانە بەكاردێت، لەم جۆرە نەخشانەشدا دیسان ڕەنگ كردن و سێبەرداركردن دەخرێتە كار تادابەشكردنی ئەو دیاردانە بەسەر ڕووی زەویدا ڕوون ببێتەوە. (سەیری وێنەكە بكە).




ئەمە نەخشەی عێراقە کە بەهۆی سێبەردارکردنەوە دابەشکردنی تێکڕای بارانی تێدا دیارە

## جـ- نەخشەکانی دەریا و زەریاکان:

ئەم جۆرە نەخشانە دابەشبوونی زەریاکان و ئەو دەریایانەش نیشاندەدەن کە لەگەڵیاندا یەکیانگرتۆتەوە و بایەخیش بە زانینی قوڵاییەکانیان دەدەن کە بە هۆی ڕەنگە شینە پلەبەپلەکانەوە دەردەخرێن (وەکو لە کلیلی ڕەنگەکان ڕوونکراوەتەوە)، هەروەها ڕێڕەو و ئاراستەی تەوژمە دەریاییەکان و دیاردەی تری سروشتی دەریاو زەریاکان ڕوون دەکاتەوە.

د- نەخشە زیندەوانییەکان (الحیویة):

ئەو نەخشانەن کە جیاوازی دابەشبوونی سامانی ڕووەك و سامانی ئاژەڵی سەر ڕووی زەوی نیشاندەدەن بۆیە ڕەنگکردن و سێبەرکاری بەکاردەهێندرێت بۆ لێك جیاکردنەوەی جۆرەکانی دارستان و گیاو ڕووەکە دڕکاویەکان.(وەکو لەم وێنەیەدا دیارە).




دابەشکردنی ڕووەکی خۆرسك

## ٢- نەخشە مرۆییەکان: کە ئەمانە دەگرێتەوە:

### أ- نەخشە ئابووریەکان:

ئەو نەخشانەن کە لایەنە جۆراوجۆرەکانی چالاکیە ئابووریەکانی وەك کشتوکاڵ،کانزاکاری،پیشەسازی،بازرگانی، ڕێگای گواستنەوەوهاتوچۆکردن بەسەر ڕووی زەویدا دابەش دەکەن و نیشانیان دەدەن ، ناوچەکانیشیان بە سێبەرکاری یان ڕەنگ یا هێما دەردەخرێن .(سەیری وێنەکە بکە).




نەخشەی سامانی کانزا لە عێراق نەوتی تێدا نییە

ب- نەخشەکانی دانیشتوان:

ئەم نەخشانە گرنگی دەدەن بەودیاردانەی کەپەیوەندیان بە پێکهاتەی دانیشتوانەوە هەیە بەو پێیەی دیاردەی جوگرافین وەکو دابەشبوونی دانیشتوان وپێکهاتەی ڕەگەز وتەمەنیان و دابەشبوون وجیاوازی چڕی دانیشتوان وجەنجاڵی یان لە جێگایەکەوە تا جێگایەکی تر . وەکو نەخشەکانیتر ئەمانیش دیاردەکانیان بەرەنگ و سێبەر و هێما دیاری کراون.

جـ- نەخشەی مۆڵگەکانی نیشتەجێبوون (مراكز الاستيطان):

ئەم نەخشانە مۆڵگە ئاوەدانەکان نیشاندەدەن، سا ئەو مۆڵگە ئاوەدانانە دێهاتی بن، یا شارستان ، کەرتەکانی پیشەسازی بن، یا بازرگانی، یا نیشتەجێبوون ، یا جێگاکانی ڕابواردن یا مۆڵگەی گواستنەوە و هاتوچۆ بن.

د- نەخشە ڕامیارییەکان:

ئەمانەش یەکە رامیارییەکان (الوحدات السياسية) ی هەموو کیشوەرەکانی جیهان دەردەخەن و بەڕەنگ یەکە یەکە ڕوونکراونەتەوە و هەر دەوڵەتەش ڕەنگی جیاوازی بۆ دانراوە .(هەروەکو لە ئەتڵەسدا دەردەکەوێت).

٣- نەخشە مێژووییەکان:

ئەو نەخشانە بایەخ بە دابەشبوونی دیاردەی ڕابردووی سروشتی و مرۆیی دەدات، وەکو نەخشەی جەنگەکان و جێگاکانیان وبڵاوبوونەوەی ئیسلام و نەخشەکانی سنووری دەوڵەتی ئیسلامی لەسەردەمی راشدین وئومەوی و عەبباسی،ونەخشەکانی ڕێگاوبانی کۆنی بازرگانی وگەشتەکانی

دۆزینەوەجوگرافییەکان وەی تر.ئەمانەش بەڕەنگ وسێبەر وهێما دەردەبڕدرێن.

گەلێ نەخشەش هەن کە بۆ مەبەستێکی دیاریکراو کێشراون، دەتوانین بەهۆی ئەو زاراوە و هێمایانەوە بیانخوێنینەوە کەلە بەشی خوارەوەیاندا هەن و کلیلی نەخشەیان پێ دەوترێت.




نەخشەیەکی مێژوویی

### نەخشەکێشان و دانانی دیاردە جوگرافییەکان لە ناویدا:

گرانە بتوانرێت هەموو دیاردەیەکی جوگرافی کە لەسەر ڕووی زەوی چاومان پێی دەکەوێت، وەکو خۆیان و بەو شێوە ڕاستەقینەیەی کە هەن لەسەر نەخشەیەکی بچووك دیارییان بکەین، ئێمە ئەوەمان خوێند کە چۆن بەشێك لەم دیاردانە بەهۆی ڕەنگەوە نیشان دەدرێت. جا بۆ ئاسانکردنی ئەو گرانییە پێکهاتنێکی وەها کراوە کە بەشێوەی هێما و نیشانەی دیاریکراو دەربخرێن، ئەم هێمایانەش لەسەر پێکهاتنێکی جیهانی بڕیاردراون و جوگرافیناس پێویستە لە نەخشەکێشاندا لێیان لانەدات، بەڵام بۆی هەیە هەندێ گۆڕینی تیادابکات ئەویش بە مەرجێك ڕوونی نەخشەکە بپارێزێت و بە ئاسانی بخوێنرێتەوە و لە کەنارێکیشەوە کلیلی بۆ دابنێت، بۆ ئەوەی هەر هێما و نیشانەیەکی، دیاردە ڕاستەقینەکەی سەر ڕووی زەوی بنوێنێت و ڕوونی بکاتەوە.

## گرنگی دیارده جوگرافییەکان و ڕێگاکانی دانانیان لەسەر نەخشە:

### ڕێگاکانی هاتوچۆ:




ئەمە نەخشەی ڕێگاوبانی ئۆتۆمبێلە لە عێراقدا

ڕێگاکانی هاتوچۆ، هێمای تاکە هێڵ، یان جووتە هێڵی باریک، یان ئەستووری بۆ دادەنرێت و بەیەک ڕەنگ یان بەچەند ڕەنگێک ڕەنگ دەکرێن . ڕەنگی ئاسایی جادەی قیرتاوکراوی ئۆتۆمبێل لەسەر نەخشەکان، سورە و، ڕەنگی جادە قیرنەکراوەکان بە هێڵی پچڕپچڕ هێما دەکرێن.

بەڵام هێڵی ئاسن، لەسەر نەخشە بە هێڵێك دەنوێنرێت کە بە ووردە هێڵ بڕراوە، یان بە جووتەهیڵێکی باریك و ڕەش دەنوێنرێت. پێوەری هێڵی ئاسن لە هەموو جیهاندا وەنەبێ یەك پێوەربێت، ئەم هێڵە کە لە دەوڵەتێکدا بە دوو پێوەر هەبن، دوو هێمایان بۆ دادەنرێت، وەکو لە عێراقدا هەیە، پێوەری پێوانەیی (ئاسایی) ئەوەیانە کە ماوەی نێوان هەردوو ئاسنەکە (١٤٢,٥) سەنتیمەترە، وەکو هێڵە تازەکەی نێوان بەغدا و موصڵ ،بەغدا و بەصرە ، هێڵی بەغدا و قائیم و عەکاشات ، هێڵی حەدیثە و بێجی و کەرکوك.




نەخشەی هێڵە ئاسنینەکانی عێراق

## شارەكان:

شارەكان هێمای جۆربەجۆریان بۆ دادەنرێت، چوارلا یان بازنەی گەورە و بچووك، ئەویش بە گوێرەی ژمارەی دانیشتوان و گرنگی بەڕێوەبەرایەتی شارەكە دیاری دەكرێت (سەیری نەخشەكە بكە).




نەخشەی ئیداری عێراق

### سنووره نێودەوڵەتی کارگێرییەکان :

هێماکانیان هێڵی پچڕ پچڕ و خاڵ دانانە و زۆرتریشی بە سوور ڕەنگ دەکرێن و ئەستوریشیان جیاوازە تا بە ئاسانی سنورە نێودەوڵەتی و هەرێمی و کارگێرییەکان بناسرێنەوە. (سەیری نەخشەکە بکە).

هێما و نیشانەی تریش هەن و زۆریشن، وەکو ڕووباری هەمیشە پڕ ئاو کە بە هێڵی شینی پێچاوپێچ یان لە نەخشە ڕەنگ نەکراوەکاندا بە هێڵێکی ڕەشی پێچاوپێچ هێمادەکرێت. ڕووبارە وەرزییەکانیش کە ئاویان پچڕپچڕە بە هێڵی پچڕپچڕی شین هێما دەکرێن، بەڵام دەریاچە و زۆنگاوەکانیش بە پەڵەی شین شین هێمادەکرێن، هەرچی چۆم وزەلکاوە کاتییەکانیشە ئەوانە ووردە هێڵی هاوتەریب و ئاسۆیی و پچڕپچڕیان بۆ دادەنرێت.

هەتا زیاتریش شارەزای هێماکانی نەخشە ببین، سوودی زۆرتری لیٚ دەبینین چونکە هێما و زاراوەکانی نەخشە زمانی نەخشەکەن.

### گەورەکردن و بچووککردنەوەی نەخشە:

بەچەند ڕێگەیەك نەخشەکان گەورەتر یان بچووکتر دەکرێنەوە،تەنیا چەند ڕێگەیەکیان دەخوێنین و ئەمانەن:

#### ١- بەڕێگەی چوار لایەکسانەکان:

ئەم ڕێگەیە ئاسانترین ڕێگای هێلکارییە کە نەخشەی پیٚ گەورە یان بچووك بکرێتەوە، بە نموونە ئەگەر بمانەوێت نەخشەیەك دوو ئەوەندەی خۆی لێبکەین، یەکەم هەنگاو دەیکەین بە چەند چوارلایەکی یەکسانەوە، ئنجا ئەو لەوحەیە دێنین کە نەخشە تازەکەی لەسەر دەکێشین، چوارچێوەیەکی

لەسەر دەکێشین کە هەر لایەکی دوو ئەوەندەی لایەکی نەخشە بچکۆڵەکە بێت (واتا درێژییەکەی دوو ئەوەندە و پانییەکەشی دوو ئەوەندەی پانیی نەخشە بچکۆڵەکە بێت). دوایی ناو چوارچێوە گەورەکەش بەش بەش دەکەین کە هەر بەشەی چوارلا یەکسان بێت، بە مەرجێ ژمارەیان ئەوەندەی ژمارەی چوارلایەکسانەکانی ناو نەخشە بچکۆڵەکە بێت و هەریەکەشیان دوو ئەوەندە گەورەتر بن، بۆ ئاسانکردنیش دێنین چوارلایەکسانەکانی هەردوو نەخشەکە لە ڕاستەوە بۆ چەپ بە (ئاسۆیی) و لەسەرەوەش بۆ خوارەوە بە (ئەستونی) ژمارەیان لەسەر دادەنێین، ئنجا بە تەواوی هەرچی لە ناو چوارلایەکسانەکانی نەخشە بچکۆڵانەکەدا هەیە، لە ناو چوارلایەکسانەکانی بەرامبەریاندا لە لەوحە گەورەکەدا دەکێشین و بەو جۆرە ئەو نەخشەیە دەردەچێت کە دەمانەوێت.(سەیری وێنەکە بکە).



بە ڕێگەی چوارلایەکسانەکان بەم شێوەیە نەخشە گەورە یان بچووک دەکرێتەوە

٢- ڕێگەیەکیش هەیە جێگای تەنگ و پێچاوپێچ پێ گەورە یان بچووك دەکرێتەوە وەکو جێگای ئاوەڕۆی ڕووبارەکان یان ڕێگاوبانی ئۆتۆمبێل یان هێڵی ئاسن یاخود ڕێگای ناو چیاکان، پێی دەوترێت ڕێگەی سێگۆشە چونیەکەکان (المثلثات المتماثلة)، چونکە ئەو جۆرە جێگایانە بە ڕێگەی چوارلایەکسانەکان گەورەکردن و بچووککردنەوەیان گرانە. (سەیری وێنەکە بکە).



٣- بەهۆی وێنەنما (الفانوس السحري):

نەخشە ئەسڵییە بچکۆڵەکە دەمەوڕوو لەسەر بنکەی هەڵگری چراکە دادەنێین، ئنجا ئەو کاغەزەی کە نەخشەکەی لەسەر دەکێشین بە دیوارێکەوە قایم دەکەین و ژوورەکەش تاریك دەکەین، ئەوجا چراکە دادەگیرسێنین و بە هەردوو چوارلادا دەیبزوێنین و زەرەبینەکەی پێشەوەش بەرەو پێش و بەرەودوا دەجوڵێنین بۆ ئەوەی وێنەی نەخشەکەمان لەناو

چوارچێوەکەدا بەو قەوارەیە بۆ دەرچێت کە دەمانەوێت، ئنجا نەخشەکە لەسەر کاغەزەکە دەکێشین کە بە تەواوی هەموو شتێکی تیادا دەرنەکەوتووە.

٤- بەهۆی ئامێری وێنەنمای ژوورسەرەوە: ( Overhead ):

تونێکڵە ڕوونەکەی نەخشەکە کە(سلاید) ی پێ دەڵێن و نەخشەکەی لەسەر کێشراوە، دەیخەینە سەر ئامێری وێنەنماکە، بەو جۆرە نەخشەکەمان بە گەورەکراوی لەسەر پەردەی وێنەنماکە بۆ دەردەچێت، ئنجا ئەو کاغەزەی کە دەمانەوێت نەخشەکەی لەسەر بکێشین دەیخەینە سەر پەردەکە و قەڵەم ڕەساس بەسەر سنوور و دیاردەکانی تری نەخشەکە دا دێنین[١].

٥- ئامێری گەورە و بچووك كردنی نەخشە (البانتوغراف):

٦- ڕێگەی کۆپی نوێ : ڕێگەیەکی لەبەرگرتنەوەی تازەش هەیە، کە ئامێری وێنەگرتنی تایبەتیی تێدا دەخرێتەکار وەکو ئەوانەی لە فەرمانگەی مەساحە(ڕووپێو) و فەرمانگە زانستییەکاندا هەیە، یان بەهۆی جیهازی کۆپی کردنی ئاساییەوە نەخشەی پێ گەورە و بچووك دەکرێتەوە.

---

[١] تکا لە مامۆستایان دەکەین ئامێرەکە لەبەر چاوی قوتابیان ئیش پێ بکەن و دیاردە جوغرافیەکانیان بۆ ڕوون بکەنەوە.

## لێکۆڵینەوەی دیتنکاری[1] و پێداویستەکانی:

لێکۆڵینەوەی دیتنکاری (کێڵگەیی) هەموو دیاردەیەکی سەر زەوی دەگرێتەوە، چ سروشتی و چ مرۆیی، بە جۆرێکی زانستیانە و وردەکاریش شیکاریان دەکات و بۆهۆیەکانی دەگەڕێت،ئەم جۆرەلێکۆلینەوەیە ئەگەردوورلەژووری لێکۆڵینەوە و خوێندن و لە دەرەوەی کتێبخانەکاندا نەکرێت و بەچاودیتن و بەکارخستنی لەگەڵدا نەبێت ئەوا لە ڕووی دروستی و ووردەکارییەوە ناتەواو دەردەچێت.

لێکۆڵینەوەی دیتنکاری ژینگەیەك بەچەند هەنگاوێك دەکرێت گرنگەکانیان ئەمانەن:

١- دەبێت ئامانجی ئەو لێکۆڵینەوە دیتنکارییە دیاری بکرێت و پلانێکی تەواوی بۆ دابنرێت و ناوچەی لێکۆلینەوەکەش دەستنیشان بکرێت.

٢- پێویستە بەهۆی نەخشەی ناوچەکەوە، دیاردە جوگرافییەکانی ناو سنووری ناوچەکە بەگشتی بەچاو ببینرێن و شارەزاییان لێوە پەیدا بکرێت.

٣- پێویستە نەخشەکە ئامادەبکرێت و جێگای دیاردە بینراوەکان دیاری بکرێت و لەو جێگایانە دڵنیا بین کە بەڕاستی دانراون و هەڵە نییە.

٤- ڕەنگە پێویستی بەوەش هەبێت کە ڕاوبۆچوونی هەندێك لە دانیشتوان وەربگیرێت، ئەوەش بە ڕەزامەندی خۆیان، یان بەشێوەیەکی هەڕەمەکی(عشوائية) ڕای هەندێکیان بە هۆی پرسیاری چاپکراوەوە وەردەگرین، یان ڕووبەڕوو چاوپێکەوتن وگفتوگۆیان لەگەڵ دەکەین.

---

[1] دیتنکاری: الميدانية.

٥- وێنەی فۆتۆگرافی ئەو دیاردانە دەبێت بگیرێت، ئەگەر ئەوەش کەڵکی نەبوو یان نەکرا دەبێت وێنەی هێلکاری بەکاربهێنرێت.

٦- لە کۆتاییدا دەرەئەنجام، چونکە پێویستە هەمیشە لە هەموو ڕاستییەکی جوگرافی بگەین کە بەچاودەیبینین و هۆیەکانیشی بزانین، بۆنموونە دەبێت ئەوەبزانین کە بۆچی باشووری ڕۆژهەلاتی بەغدایان بە باش زانیوەکەپالأوگەی دۆرەی لێ دابمەزرێنن،ئەوەش لەبەر ئەوەی کەهەموو بەغدا بای باکوری ڕۆژئاوای بەسەردا هەڵدەکات بەرەوباشوری ڕۆژهەلات ، کە ئەمەش هەموونەو دووکەڵ وهەڵم وغازانە لەدانیشتوانی بەغدا دوور دەخاتەوە.

ئەمەی خوارەوەش نموونەیەکی لێکۆڵینەوەی دیتنکاری نیشتەجێبوون و گیرسانەوەی دانیشتوانە[١]:

١- دیاریکردنی جێگای گوند یان ئەو ناوچەیەی لێی دەکۆڵدرێتەوە و، دەستنیشانکردنی ئەو ڕێگە و شارێگانەش کە دەگاتە ناوی و، ئەو مۆڵگە نیشتەجێیانەش کە لێیەوەی نزیکن.

٢- ئەو هێلکارییەی لەسەری دامەزراوە:

أ- ئایاهێلکارییەکی دیاریکراوی وەها هەیە کە خانووەکانی لەسەردروست کرابێت؟ بۆ نموونە، کە ئەومالأنە لەگوێ چەم وناوبن، یان بەکۆمەڵن وەکو کۆمەڵگەکانی نیشتەجێبوون، یان دەکەونە گەڕەکێکی کۆنەو و هێلکاری بۆ نەکراوە،یان لەگەڕەکی هێلکاردان، یاخودخانووەکان وەکو یەکن یان جیاجیان.

---

[١] تکایە قوتابیان هان بدەن بە گوێرەی ئەم هەنگاوانە هەر یەکە و لەبارەی ناوچەکەی خۆیەوە ڕاپۆرت بنووسن.

ب- ئەمەن و جۆری خانوو و باڵاخانەکانی ناوچەکە.

جـ- ئایا ناوچەکە دابەشکراوە بۆ چەند گەڕەکێکی جیاواز و هەرگەڕەکێکیش سنووروتایبەتمەندێتی و ناوی تایبەتی خۆی هەیە؟

د- ئایا خانوو وباڵاخانەکانی گوندەکە، یان ناوچەکە دیکۆر و شێوازێکی تایبەت و دیاریکراویان هەیە؟ ئەو شتانەش کەلە بیناکردندا بەکارهێنراون، قوڕ، خشتی سوور، بەرد، کۆنکریت، یان داروتەختە و شتی تر، دەبێت بزانین.

هـ- ئەو خزمەتگوزاریانەی لە شارەکە و گوندەکەدا هەیە: وەکو دوکانی خواردەمەنی و سەوزە و میوە و جلوبەرگ و پێڵاو و تفاق و شوشەسازی و جێگای فرۆشتنی ڕۆژنامەو جگەرە و کتێب و شیرینی و پێداویستی وەرزشی و ئوتوچی و جێگای پاککردنەوە و دوکانی زێڕەنگەری و سەرتاش و تفاقی ناوماڵ و سەمونخانە و وەکالەتی گشتی و شتی تر.

و- ئایا قوتابخانەو کتێبخانە وگەرماو وفەرمانگەحکومییەکان وئوتێل و چایخانە وچێشتخانە وبانك و پۆستە و گەراج و دوکانی بازرگانی و نەخۆشخانەو جێگای گەشتوگوزار و فەرمانگەی ئاوو کارەبا و غازی تیادا هەیە؟

ز-ئایا ئیشێکی پیشەسازی لەشارەکەدا یان لەنزیك گوندەکەوە دەست دەکەوێت،یان نییە؟ ئەگەر هەیە چ جۆرێکە؟ قوتابی دەتوانێ بە ڕەنگ لەسەر نەخشەکان فرمان و خزمەتگوزاری و دانیشتوان دابەش بکات و بەهۆی ئەم شارەزایی و زانیارییانەوە دەشتوانێت بزانێت کەلەو شارە یان لەو گوندە یان لەو هەرێمەدا بۆ دوارۆژ چ گۆڕانێك ڕوودەدات.

## بەشی سێیەم

## بەندی یەکەم

### پێکهێنەرەکانی توێکڵی زەوی

توێکڵی زەوی بە گشتی لە جۆرەها تاوێر(بەرد) پێکهاتوە و،بگرە ئەو خۆڵ و خاکەش کە ڕووی گەلێ بەشی ووشکانیشی داپۆشیوە، هەر بریتیە لە وورده هاڕاوەی ئەوتاوێرانە.تاوێرەکانیش گەلێ جۆرن وهەرجۆرەیان سیفەتی تایبەتیی خۆی هەیەولە هی ئەوانیتر جیان، هەندێکیان ڕەقن، هەندێکیان جیڕن، هەندێکیان پێکهێنەرەکانیان لەگەڵ یەکتریدا گونجاون وهەندێکیان نەگونجاون، هەندێکیشیان قاڵ بوون ولە وورده تاوێری قاڵبوو (متبلور) پێکهاتوون و لە سیفاتی تریشدا جیاوازن. تاوێرەکانی توێکڵی زەوی سیفاتی جۆراوجۆریان هەر چۆنێك بێت، ئەسڵیان یەکەو هاوبەشە، هەرئەو تاوێرانەشن کە یەکەم جار لەکاتی ڕەقبوونی توێکڵی زەویدا لەرۆژگارە جیۆلۆجیە دێرینەکاندا پێکهاتوون.ئەو هەلومەرجانەش کە ئەو تاوێروبەردانەی ئێستایان تێدا دروستبووە،هەر ئەوهەلومەرجانەن کەئەو تاوێرانەیان بەو جۆربەجۆریە ڕەخساندووە وسیفەتی جیاوازیان پێ بەخشیون.

تاوێرەکان لە هەلومەرج وباری جۆراوجۆردا پەیدا دەبن، جاری وا هەیە ماددە تواوەکانی ناو زەوی کەفو کوڵ هەڵدەچن و بەناو چینەکانی توێکڵی زەمیندا یا بۆ دەرەوەی زەوی گوژم دەدەن،وەکو لەکاتی تەقینەوەوهەڵچونی کانییە ئاگرینەکاندا ڕوودەدات،جا کەئەو ماددە تواوانە ساردەبنەوە،تاوێری

قاڵبووی زۆر سەرت(شديدة التماسك)یان لێ پەیدا دەبێت،بەم جۆرە تاوێرانە دەوترێت(تاوێری ئاگرین).

تاوێرەکان بەهۆی ئەو کارتێکەرانەشەوە پەیدا دەبن و پێك دێن، کە ڕووی توێکڵی زەمین دادەڕۆشێنن و ڕای دەماڵن و ووردی دەکەن و ئەو ووردەیە لەگەڵ خۆیاندا وە پێش دەدەن و دەیبەن تا هەلومەرجێکی سروشتی بۆدەڕەخسێت، ئیتر لەوێدا دەنیشێت و کەڵەکە دەبێت و چین لەسەر چین ئەو نیشتوانە قورساییەکی ئەوتۆی دەخەنە سەر کە ئەوانەی بنەوە ڕەق دەبن، یان بەهۆی ماددەی نیشتەنیی جۆشکارەوە کە لە ئاودزەکانەوە دێتە ناوی بۆشایی نێوان پارچەکانی پڕ دەکەنەوە و بەیەکەوە جۆشیان دەدەن و ڕەقیان دەکەن و، هەروەکو ئەو بارەیان لێ دێتەوە کە پێش ڕامالێن و ووردبوون بوونە، بەم جۆرە تاوێرانەش دەوترێت: (تاوێرە نیشتەنییەکان).

جگە لەوانەی باسکران تاوێرەکان بەجۆرێکی تریش پەیدا دەبن، ئەوەش کاتێك ڕوودەدات کە تاوێرەکانی هەردوو جۆرەکەی پێشوو بە هۆی لەرینەوەی بەتینی زەوییەوە، لە کاتی هەرەس و داخلیسکان و ڕۆچووندا، بە بوومەلەرزە یا بە قڵیشان و شکانی توێکڵی زەمین، ڕۆدەچن و دەکەونە بنەوە و پەستانێکی گەورەی ئەوتۆیان دەکەوێتە سەر و گەرمییەکی وەهایان تووش دەبێت دەیانتوێننەوە. دوای ساردبوونەوەشیان دەبن بە تاوێری تازە و لە سروشتی خۆیان لادەدەن و دەگۆڕێن و پێیان دەوترێت: (تاوێرە گۆڕاوەکان).

جا لەبەر ئەوەی تاوێرەکان لە هەلومەرجی جیاواز وجۆراوجۆردا پەیدادەبن، دەتوانین بیانکەین بە سێ جۆرە کۆمەڵەی گەورەوە، کە ئەمانەن:

(١) ئاگرین (٢) نیشتەنیەکان (٣) گۆڕراو

شایانی ئەوەشە کە لە هەر کۆمەڵەیەکیانەوە بدوێین، تا بزانین هەر کۆمەڵە و چەند جۆرە تاوێری گرنگی تێدایە و سیفەتە سەرەکییەکانیان چییە و سوودیان بۆ ئادەمیزاد چییە.

## یەکەم- کۆمەڵەی تاوێرە ئاگرینەکان:

بریتین لە کەرە تۆپەڵی بێگەرد کە ووردە هەناسەیان لەناودانییە وجۆشخواردوو، و ڕەق و سەرتن، وتاوێری قاڵن، چونکە لەقاڵەکانی کانزاکان پێکهاتوون و کانزای جۆراوجۆری زێڕ و زیوو و مسیان تێدایە.

هیچ نیشانەیەکی ماددەی ئەندامییان تێدانییە، زۆر بەتینیش بەرگەی کاری داماڵین دەگرن و ئاوی بەتین و خوڕ و با کاریان لێ ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەی پلەکانی گەرمی ڕۆژ و شەو کاریان لێ دەکات و لێکیان دەترازێنێت و بەرەبەرە دەیانکات بە تۆپەڵ (كتلة) ی بچووك بچوك و وورد دەبن تادەبن بە ڕەگەزە کانزای جۆراوجۆر.

گرنگترین تاوێرەئاگرینەکایش بریتین لە بازلت و گرانیت کە بە زۆری بەسەر ڕووی زەمیندا بڵاون، بەتایبەتیش لەو ناوچانەدا کەلە چاخە جیۆلۆجیە دواییەکاندا کانییە ئاگرینەکانیان تێدا تەقیوەتەوە. تاوێر و بەردی ئاگرین جاروبار بۆ بیناکردن و بەردەڕێژی ڕێگاوبان بەکاردەهێنرێن.



ئەمە نمونەکانی تاوێرە ئاگرینەکانە

## دووەم- کۆمەڵەی تاوێرە نیشتەنییەکان:



ئەمە نمونەی تاوێرە نیشتەنیکردەکانە

ئەم جۆرەیان لە هەموو جۆرەکانی تر زیاتر بەسەر ڕووی زەمیندا بڵاوە و هەیەو، ئاساییش چین چینی هاوتەریب و چین لەسەر چین هەڵکەوتوون، لەبەر ئەوە جاروبار (تاوێرە چین چینەکان)یشیان پێ دەوترێت.تاوێرە

نیشتەنییەکان زۆرتر پێکهاتووی دەریاکردن کە لە دەریا سوێرە کەم قوڵەکاندا نیشتوون، بەلاَم ئێستا لە جێگای وادا هەن کە لە ئاستی ڕووی دەریا بەرزترە، هۆیەکەشی ئەوەیە کە ئەم جێگایانە کاتی خۆی تووشی جموجۆلی زەوی هاتوون و بەرەوژوور دەرپەڕیون و بەرزبوونەتەوە، بەوجۆرە ئاوی دەریایان لێ کشاوەتەوە کە لەوەوپێش داپۆشیبوون. لە گرنگترین جۆرەکانی تاوێرە نیشتەنییەکان بریتیە لە تاوێری کلسی یان (جیری) کە لە کەڵەکەبوونی پەیکەرە ڕەقەکانی زیندەوەرە دەریاییەکان پێکهاتووە، سا ئەو پەیکەرانە کامڵ بووبن، یان ووردبوون و بوون بە گەردیلەی بچووك و تەنك،کەڵەکەبوونی ئەو پەیکەرانەش چەندین نەوەی دوورودرێژی خایاندووە. لە ناو دەریاکاندا گیانەوەری بێ بڕبڕەی ئەوتۆ دەژین کە مادەی گەچین لە لەشیانەوە دەردەدەن و قاپوورەکەیانی (پەیکەرەکەی کە خۆیانی پێ دادەپۆشن)پێ دروست دەکەن، وەکو گیانلەبەری (فۆرامنیفرا) و میتر، کە وەچە بە وەچە پەیکەرەکانیان لە دێر زەمانەوە کەلەکەبووە و ئەم تاوێرە گەچینەیان پێکهێناوە.

هەندێ بەردوتاوێری نیشتەنی کردیش بە ڕێگەیەکی کیمیایی پەیدابوون وەکو (ئەستەلەکتایت) کەلە ئەشکەوتەکانی کوردستان بە زۆری هەن، ئەم جۆرە ئەستەلەکتایتە بەوە پەیدا دەبن کە باراناو بە ناو تاوێرە نیشتەنی کردەکاندا دەڕوات و بەهۆی ئەوەشی کە باراناو دووەم ئۆکسیدی کاربونی پێوەیە، گەلێك لە ماددە گەچەکانی ئەو تاوێرانە دەتوێنێتەوە، هەر زووبەزووش ئەو گەچاوە بە باراناوەکە لە درز و قلێشی بنمیچ و دیواری

ئەشکەوتەکەوە سەردەردەکات، هەر کە هەواش لێی دەدات ئاوەکەی دەبێت بە هەڵم ومادده گەچەکەش بە شێوەیەکی قاڵ چین چین تۆپەڵە دەبەستێ و ووردەووردە زیاد دەکات و وەکو کۆڵەگە لە بنمیچی ئەشکەوتەوە بەرەو خوار شۆڕ دەبێتەوە و(ئەستەلەکتایت)ی پێ دەوترێت. لەوانەشە بە پێچەوانە هەر لە ناو ئەشکەوتەکەدا لە بنەوە بۆ سەرەوە دروست ببێت کە وەکو کۆڵەگەیەك بەسەر زەوی ناو ئەشکەوتەکەوە دەوەستێ و پێی دەوترێت (ئەستەلەکمایت). تاوێری نیشتەنیکردی لمکار و گلکاریش (قایە) بە شێوەیەکی ئامێرکار پەیدا دەبێت، شێوەی ئامێرکاریش ئەوەیە کە لمەکە دەنیشێتە سەر یەك و هەندێ مادەی جۆشخواردووشی تێدا هەیە کە وەکو چیمەنتۆ دەنکە لمەکان بەیەکەوە جۆشدەدات و دەبێت بە بەردی لمکار کە بە کوردی (قایە)ی پێ دەڵێن. جۆرە تاوێرێکی تریش بە تۆپەڵ هەیە کە لە زیخ و لم و وردە بەرد پێکهاتووە و ئەویش لەکوردستان زۆرە، ئەم جۆرە تاوێرە لە کەندرەکەی ڕووباری دیجلەی لای سامەڕاشدا دیارە و بەستەکەی سامەڕای بە ئاسانی لەسەر دارێژراوە.

زۆربەی تاوێری نیشتەنیکرد هەناسەدارە، بەتایبەتیش قایە، کە لە ڕووی ئابووریەوە زۆر بە بایەخە، چونکە ئاوێکی زۆر دەمژێ و گلێی دەداتەوە کە لە کاتی بێ ئاویدا دەردەهێنرێت و سوودی لێ وەردەگیرێت، زۆربەی ئەم تاوێرانە کە پاشماوەی ئەندامیی گیاندار، یان هی ڕووەکییان تێدایە جۆری ژیان وچۆنێتی ئەو ژینگەیەشمان بۆ ڕووندەکاتەوە هی ئەو کاتەی کە ئەو تاوێرانەی تێدا پێکهاتووە.




ئەمە وێنەی ئەستەلکتایت وئەستەلکمایتە

## سێیەم- کۆمەڵەی تاوێرە گۆڕراوەکان:

تاوێرە گۆڕاوەکان زۆرجار لەو تاوێرە ئاگرینانە دەچن کە لەناو زەویدا ڕەق بوون، چونکە وەك ئەوان ڕەق وسەرتن و قاڵبوەکانیان گەورە گەورەن، بەڵام هەندێ جار بەشێوەی چین لەسەرچین دەردەکەون بەمەیاندا لە تاوێرە نیشتەنییەکان دەچن،بۆنموونە تاوێری (شەست) واتا (تەلەبەرد) نیشانەی چین چینی پێوەدیارە و چینەکانی تەنك و هاوتەریبن وبە ئاسانی لێك جیادەکرێنەوە، وە(مەرمەڕ)یش لەم تاوێرە گۆڕاوانەیە و تاوێری گەچە و بۆ بیناکردن بەنرخەوگرنگە. (کوارتز)یش دیسان تاوێری گۆڕاوە و ئەسڵەکەشی

تاوێری لمکاره (قایەیە)،کوارتز تا بلێی ڕەقە و قاڵەکانی زۆر بە توندی پێکەوە سفت و سەرتن زووش شی نابێتەوە لەبەرئەوە بە جێگا بەرزەکانی سەر ڕووی زەمینەوە بە زۆری هەیە. (نایس)یش تاوێری گۆڕاوە و ئەسڵەکەی تاوێری گرانیتە،لەبەرئەوەزۆر ڕەقەوگەردیلەکانی بۆ پەرداخکردنی کانزایەکان بەکاردەهێنرێت. بەڵام (ئردواز) ئەسڵەکەی تاوێری گڵکارە.

## بەندی دووەم

### بەرزی و نزمی و هۆیەکانی پەیدابوونیان

#### بەرزی و نزمیی زەوی:

زاراوەی بەرزی ونزمی زەوی بۆ ڕوونکردنەوەی دیاردەی جۆراوجۆری بەرزی و نزمی سەر ڕووی زەمین بەکاردێت. ئەم دیاردانەش چیا و گرد و بان و دۆڵ و دەشت دەگرێتەوە کەبەکورتی باسیان دەکەین :

#### یەکەم: چیا و گرد:



ئەمە وێنەی چیایە

هەلومەرجی پێکهاتنی چیاکان لە هی گردەکان جیاوازیەکی زۆری نییە، لەبەر ئەوە باسی هەردووکیان دەکەین. هەرچی چیاکانە زۆر بەرزن و لوتکەکانیان زۆرتر باریك و تیژە و ڕووبەریان تەسکە، سنگ و لاپاڵەکانیشیان زۆر لێژە. کۆمەڵە چیاو شاخێکیش کە یەك لە دووی یەك بەدەم یەکەوە ڕێز

ببەستن بۆ مەودایەکی درێژ پێی دەوترێت (زنجیرە چیا) واتا ڕیزەشاخ. زنجیرە چیاکان گەلێ لوتکەی بەرز و نزمیان هەیە بەڵام هەموویان لە ڕاستی یەکن ولەسەر یەك هێڵن، وەك زنجیرە چیاکانی زاگرۆس لەکوردستان.

هەرچی گردەکانە لە چیاکان نزمترن و کووڕن و هەندێ لوتکەشیان هەیە، بەرزیی گردەکان لە ڕووی ئاوی دەریاوە بیگری لە (١٠٠٠) مەتر تێناپەڕێت، بۆ نموونە گرد و زورگەکانی حەمرین کە لە عێراقدان، بەرزترینی لوتکەکانی (٥٢٧) مەتر بەرزە. سنگ و لاپاڵی گردەکان کەمتر لێژن ئەگەر بێتو باران بیانگرێتەوە لە سنگ و لاپاڵی چیاکان بۆ کشتوکاڵ لەبارترن.



ئەمە وێنەی گردە

## جۆرەکانی چیا:

چیاکان بە گوێرەی جۆری پێکهاتنیان ئەمانەن:

### ١- چیا چەماوەکان:



جوڵەی چەماوەیی توێکڵی زەوی

ئەوانەن کە بەهۆی چەمانەوەی توێکڵی زەمینەوە پەیدابوون، کە هەندێ پارچەی ئەم توێکڵە لەیەك لاوە یان لەدوولاوە کەوتۆتە بەر پاڵدان و چینەکانی چەماونەتەوە و کووڕی و چاڵاییەکی زۆریان تیادا پەیدابووە (سەیری وێنەکە بکە). ئەم جۆرە چیایانە لە هەموو جۆرەکانیتر زۆرتر و بڵاوتر و بەرزترن، چیاکانی کوردستانیش لەو جۆرەن، هەروەها چیاکانی هیمالایا لە کیشوەری ئاسیا و چیای ڕۆکی لە کیشوەری ئەمریکای باکور و چیاکانی ئەندێز لە کیشوەری ئەمریکای باشور.



وێنەی برگەیەك لە چیا چەماوەکان

## ٢- چیا گڕکانیەکان (کەڵەکەبووەکان)



چیایێکی گڕکانی

ئەمانە بەهۆی کەڵەکەبوونی ماددە دەرهاوێژراوەکانی گڕکانەکانەوە پەیدابوون و وەکو قووچەکێکی نووك تیژ قوت بوونەتەوە، بەرزاییشیان لەگڕکانێکەوە بۆ گڕکانێکی تر وەکو یەك نییە، چونکە زۆری و کەمیی ئەو ماددە تواوانەی کە لە ناو زەوییەکەوە دەردەپەڕن، هەروەهاش هێزی تەقینەوەی گڕکانەکانیش جیاوازن، چیا گڕکانیەکان مەگەر بەدەگمەن زنجیرە چیای تێدا هەبێت، چونکە تەنیا تەنیا پەیدا دەبن و لێرەولەوێ بەگوێرەی ئەو ناوچانەی تووشی چالاکی گڕکانەکان بوون، پەیدابوون. لە

گرنگترین چیا گڕکانیەکان وەك چیاکانی یەمەن و، چیای (فۆجی یاما) لە یابان . (سەیری وێنەکە بکە).



دەمی چیایێکی گڕکانی

## ٣- چیا شکستکردەکان:





ئەم دوو وێنەیە ، چیای شکستکرد دەنوێنن

بەهۆی شکانی توێکڵی زەوییەوە پەیدابوون، بەم شکانەش لایەکی ئەو توێکڵە ترازاوە و ڕۆچووە و لایەکەی تری وەکو خۆی ماوەتەوە یان بەرزتریش بۆەتەوە و، لەهەردوو حاڵەتەکەدا چیای شکستکرد پێك هاتووەلە

زەویە بەرزبووەکانی تەنیشت زەویە ڕۆچووەکان. (سەیری وێنەکە بکە)،بۆ نموونە زەوییە ڕۆچووەکانی ژێر دەریای سوور کاتی خۆی کە وەها ڕۆچووە و کەوتووەتە قووڵی، لە هەردوو شانییەوە زەوییەکان بەرزبوونەتەوە، لە شانی لای ڕۆژهەڵاتیەوە چیاکانی (سەرات) و لە شانی لای ڕۆژئاوایەوە چیای تر لە خاکی میصر و سودان پەیدابووە.

### ٤- چیا ڕووتەوەبووەکان (داتاشراوەکان):

هەموو جۆرە چیایەك بەر هۆیەکانی ڕامالین وداماڵین دەکەون، بەم هۆیانەوە لووتکەکانیان دادەماڵرێن و دادەتاشرێن و دۆڵ و چاڵاییەکانیان پڕدەبنەوە و شێوەیان دەگۆڕێت، چیا چەماوەکان زۆرتر تووشی ئەم کارانەدەبن، بەتایبەتیش لوتکە بەرز و تیژەکانیان، چونکە ئەم لوتکانە لە بەشە چاڵەکانی تریان کەمتر خۆی گرتووە و زیاتریش بەر کاری باراناو و باو بەفر و گەرما گۆڕکێ دەکەون، بەڵام جێگا نزمەکانیان ئەو ڕاماڵراوەیان تێدادەنیشێت و لە کاری ڕووتاندنەوە دیانپارێزێت. لوتکە کوڕ و و تیژەکان بەر کاری ڕووشان و داتاشین دەکەون و ڕادەماڵرێن و درز و دۆلی قوڵیان تیادا پەیدا دەبێت، کەچی جێگا چاڵەکان ئەو ڕاماڵراوەیان تێدا دەنیشێت و بەرەبەرە پڕ دەبنەوە و بەرز دەبنەوە، بەم جۆرە باری زەوی شاخاوی دەگۆڕرێت و بەپێچەوانەی باری پێشوو شێوەیەکی تازە وەردەگرێت و لوتکە ئەسڵییەکان چاڵ دەبن و چاڵە ئەسڵییەکانیش کووڕ دەبن. چیاکانی (ئەپەلاش) کە کەوتوونەتە ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئەمریکای باکوور نموونەی ئەم جۆرە چیا ڕووتەوەبووانەن.

### دووەم- بانەکان:

زەوی بەرزن و ڕووەکانیان زۆرتر تەختانە و سەختی و هەورازونشێویان کەمە، بەڵام ناوبەناو هەندێکیان چەند دۆڵ وشێو و چەند لوتکەیەکی نزم و پەرش و بڵاویان تێدایە، بەو جۆرە جیاوازییان لەگەڵ چیاکاندا ئەوەیە کە بانەکان تەختاییان زۆرە و سەختیان کەمە، بەڵام لە دەشتەکان بەرزترن، ئەگەر ئەم جیاوازییە نەبوایە نەماندەزانی کامە بانە وکامە دەشتە.

بانەکان بە گوێرەی هەلومەرجی پەیدابوونیان چوار جۆرن، کە ئەمانەن:

### ١- بانە چەماوەکان:

ئەو بانانەن کە بەهۆی چەمانەوەی توێکڵی زەمینەوە پەیدابوون، بەڵام چینەکانی توێکڵەکە ئەوەندە ڕەقن کە چەمانەوەکە کاری تەنیا لە قەراغەکان کردووە، لەبەرئەوە بە دەوروبەری بانەکەدا زۆرتر چیای بەرز پێکهاتووە،کەچی بەشەکانی تری هەرچەندە بەرزبوونەتەوە بەڵام چەمانەوەو و ئاڵۆزییان کەمترە، تەنیا ئەوەندە هەیە ئەو چەمانەوەیە کاری تێ کردووەوبەرزی کردۆتەوە.بانی (تبت) کە چیاکانی (هیمالایا) و(کون لن) دەوریان داوە،هەروەها بانی(شطوط)لەجەزائیر کە چیاکانی ئەتڵەسی کەنار دەریا وچیاکانی ئەتڵەسی بیابانی دەوریان داوە نموونەی ئەم جۆرە بانەن.

## ٢- بانە داتاشراوەکان:

لەو ناوچە شاخاویانەدا پەیدابووە کە هەمیشە کاری رامالین وداماڵینیان بەسەرەوە بووە وبەردەوام بەشە بەرزەکانی ڕاماڵیوە ودایتاشیوە چاڵ و دۆڵەکانی پێ پڕکردۆتەوە، بەو جۆرە ڕووەکەی وەکو تەختایی لێهاتووە، بێگومان لەدەشتەکانیش بەرزترە.بانەکەی (لەبرادۆر) لە باکوری ڕۆژهەلاتی ئەمریکای باکوور نمونەی ئەم جۆرە بانەیە.

## ٣- بانە گڕکانییەکان (کەڵەکەبووەکان):

لەو تاوێرو بەردە تواوانەوە پەیدابوون کە لە تەقینەوەی گڕکانەکانەوە دەرپەڕیون و ڕووبەرێکی فراوانی زەویان داپۆشیوە و کەلەکە بوون و ئەم جۆرە بانە بەرزانەیان لێ پەیدابووە. بانی حەبەشە و یەمەن و بەرازیل نموونەی ئەم جۆرە بانەن، زۆرتریش لەسەر ئەم جۆرە بانانە چیای گڕکانی هەیە کە بەهۆی چالاکی ناوبەناوی گڕکانەکانەوە دروست بووە.

## ٤- بانە شکستکردەکان:

ئەو بانانەن کە بەهۆی شکان و ترازانی هەندێ جێگای توێکڵی زەوییەوە پەیدابوونە و بەو هۆیەوە ناوچەیەك لە ناوچەکانی تری دراوسێی بەرزتر بۆتەوە و بانێکی لێ دروست بووە کە بە چیای شکستکرد دەورەدراوە، کەنارەکانی ئەم جۆرە بانە زۆرتر کووڕ و لێژن. بانی مەنگۆلیا لە کیشوەری ئاسیا، وبانی سینا لەم جۆرە بانەن.

## سێیەم: دۆڵەکان:

دۆڵ زەوییەکی نزم و تەنگەبەرە، بە درێژایی هەر دوولاشی بەرزاییە، مەرجیش نییە بنی دۆڵ ئەوەندە قووڵ بێت کە لە ئاستی ڕووی دەریا نزیك ببێتەوە، دۆڵی وا هەیە بنکەکەی هەزاران مەتر لە ئاستی ڕووی دەریا بەرزترە و هی واش هەیە لەو ئاستە نزمتریشە.

دۆڵەکان دوو جۆری سەرەکین:

### ١- دۆڵە تەکتۆنیەکان:



ئەم وێنەیە دۆڵێك نیشان دەدات

ئەمانە بە هۆکاری ناوەوەی زەمین پەیدابوون و دوو جۆرن:

### یەکەمیان: دۆڵە چەماوەکان:

بەهۆی چەمانەوەی توێکڵی زەمینەوە پەیدابووە و بەشە چاڵەکانی بوونەتە دۆڵ و بەشە قۆقزەکانیشی بونەتە چیا. زۆر جاریش نیشتەنی لەناو هەندێ لەم دۆڵانەدا دەنیشێت و بەرەبەرە وەك دەشتایی لێ دێت، پێی دەڵێن

دەشتی ناو شاخ، وەك دەشتی هەریر و دەشتی شارەزوور لەناوچەشاخاویەکانی کوردستان.وە دۆڵەکانی ڕووباری (ئیراوادی و سەلوین و میکۆنگ)ی باشوور وباشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا.

دووەمیان: دۆڵە شکستکردەکان:

کە بەهۆی شکان و قلیشانی بەهێز و گەورەی توێکلی زەمینەوەپەیدابووە وکەندڕ ودۆلی لێ دروست بووە، وەکو ئەو دۆڵەی کە بەشێکی (ڕووباری ئوردن)ی پێدا دەڕوات، بەشەکەی تری بریتیە لەدەریای (مردوو) و(دۆلی عەرەبە) تادەگاتە دەم کەنداوی عەقەبە.

٢- دۆڵە داتاشراوەکان:

ئەو دۆڵانەن کە بەهۆکاری رامالین و دامالینی جۆراوجۆری وەکو ئاوی خوڕ وبای توند وگۆڕانکاریی هەوا وگەرمیی وڕووبارە سەهۆڵبەندانەکانەوە پەیدابوون.ئەو دۆڵانەی لە (بادية الشام) و بانی ڕۆژئاوای عێراقدا هەن وەکو دۆڵی (وادی حۆران) نموونەی ئەم جۆرە دۆڵانەن.

### چوارەم: دەشتەکان:

ئەو زەوییە فراوانە تەختانەن کە زۆر لە ئاستی رووی دەریاوە بەرزتر نین و جاروباریش رووەکانیان کەمە بەرزی ونزمی یەکی پێوەدیارە، بەرزاییان لە (٢٠٠م) تێناپەرێت، هەندێ بەشیشیان جاری وا هەیە لە ئاستی رووی دەریا نزمترن وەکودەشتەکانی باکوری دەریای قەزوین و هەندێ بەشی دەشتی ئەوروپا لە ناوچەی هۆڵەندە، کە بە ناوی (زەویە نزمەکان)ەوە بەناوبانگن.

دەشتەکان لە رووی جۆری پەیدابوونیانەوە، جیاوازن، وا بە کورتیش یەکە یەکە باسیان دەکەین.

#### ١- دەشتە رووتەوەبوەکان:

دوو جۆرن کە ئەمانەن:

أ- دەشتە داتاشراوەکان.

ب- دەشتە رووتەوەبووەدەریاکردەکان، یان (دەشتەکانی رۆخی دەریا).

#### أ- دەشتە داتاشراوەکان:

ئەو دەشتانەن کە لە ئەسڵا ناوچەی بەرزبوون و،بەهۆکاری رامالین و داماڵینی وەکو هەواو ساردی وگەرمی باو ئاوی خورو رووباری جۆربەجۆری سەهۆڵبەندانەوە داخوراون وتەخت بوون وتا ئاستی رووی دەریا نزمبوونەتەوە. کانی سەهۆڵبەندەکان هۆی گەورەی پەیدابوونی ئەو جۆرە دەشتانەن و، لەگەڵ گەلێ هۆی تریش. بەشەکانی باکوری کەنەدا نموونەی ئەم جۆرە دەشتەن.

### ب- دەشتە رووتەوەبووە دەریاکردەکان ـ دەشتەکانی ڕۆخی دەریا):

ئەم دەشتانە دروست دەبن بەهۆی ئەوەی کە تاوێرەبەردەکانی ڕۆخی دەریا هەمیشەوبەردەوام دەکەونە بەرکاری کاولکاری گوژمە دوانەهاتوەکانی شەپۆلی دەریا، جا بە تێپەڕبوونی کات ئەو تاوێرانە وورد دەبن و بە درێژایی رۆخەکانی دەریا دەنیشن و دەشتی ڕۆخی دەریایان لیّ پەیدادەبێت.چالاکی وجولّەی ناوەوەی زەمینیش لەو رۆخانەدا دیسانەوە هۆکارێکی دیکەی دروستبوونی ئەم جۆرە دەشتانەن،لەوانەیە ئەو چالاکیە ئەو رۆخانە کەمێك بەرزبکاتەوە کە هێشتا لە بن ئاودان وئاوەکە بکشێتەوە و ووشکانی تازەی لیّ پەیدا ببێت، لەوانەشە ئاوی دەریاکە بدا لە نزمی و لەرۆخەکان بکشێتەوەو ووشکانیی تازە دەربکەوێت.ڕووی ئەم ڕۆخەدەشتانە سەربەرەو دەریا لێژن وئەو لێژییەش بەژێر ئاوی دەریاکەدا بەردەوامە وبەم جۆرە جێگایەش دەووترێت(شۆستەی کیشوەر).ڕۆخە دەشتەکانی دەریای ناوەڕاست لەسوریا،نموونەی ئەم جۆرە دەشتانەن.

### ٢- دەشتە نیشتەنیکارەکانی ڕووبارەکان (دەشتە خلّتەکردەکان):

ئەو دەشتانەن کە لە نیشتنی خۆلّ و خلّتەی ڕووبارەکان پێکهاتوون.

گرنگترینیشیان ئەمانەن:

### أ- دەلتا دەشتەکان(١):




پێی دەڵێن دەلتا چونکە لەپیتی (دال) ی ئەغریقی دەچێت کەوەک سێگۆشە وایە

لە ڕێژگەی ئەو ڕووبارانەدا پەیدا دەبێت کە دەڕژێنە ناو دەریا، کەنداو، یان دەریاچەی گەورە. هۆی پەیدابوونی ئەم جۆرە دەشتانەش ئەوەیە کە ئەو زەوییەی ڕووبارەکەی پێدادەڕوات زۆر لێژ نییە، لەبەر ئەوە ئاوەکەی ئەو گوژمەی نییە کە هەموو خڵتەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات، بۆیە هەتا لە ڕێژگەکەش نزیکتر بێتەوە و سوکتر بڕوات بەرەبەرە خۆڵ و خڵتەکەی دەنیشێت. بێگومان ڕووبار کە دەگاتە دەریا و ئاوەکەی دەوەستێت و پەنگ دەخواتەوە، هەموو خۆڵ و خڵتەکەی لەوێدا دەنیشێت، بە تایبەتیش ئەگەر ئاوی ئەو ڕۆخە دەریایە مەنگ بێت. ئەم دەلتا دەشتانەش تا بڵێی تەختایین و کەمێکیش لە ئاستی ڕووی دەریا بەرزترن، زۆنگاویشیان تێدا پەیدا دەبێت، وەکو دەلتاکەی نیل لە میصر.

---

(١) پێی دەڵێن دەلتا چونکە لە پیتی (دال) ی ئەغریقی دەچێت کەوەک سێگۆشە وایە.



دەشتی لافاو کرد

ب- دەشتە لافاوکردەکان:

ئەم جۆرە دەشتانە لە بەشەکانی خوارووی ئەو دۆڵانەدا پەیدادەبن کە ڕووبارەکەیان پێدادەڕوات، چونکە لەو جێگایانەدا ڕووبارەکە ئەو گوڕژم و خوڕییەی نامێنێ کە لەوەزیاتر ئاوەڕۆکەی خۆی بدرێت، لەبەر ئەوە ئەو ئاوەڕۆیە ئاوی لافاو ناکێشێت، بۆیە لافاوەکە ناچار هەڵدەکشێ و زەویەکانی ئەمبەر و ئەوبەر دادەپۆشێت و خۆڵ وخڵتەکەی لەوێدا دەنیشێت و ساڵ بە ساڵ زیاد دەکات.

قەراغەکانی ئەو ڕووبارانەی دەشتی لافاوکردیان لێ پەیدابووە بەرزن و هەتا لەو قەراغانەش دوورتر بەرەو دەریا بکشێن بەرەو لێژی دەچن. قەراغی ئەم جۆرە ڕووبارانە کە هەردوو شانی ڕووبارەکەیان پێ دەوترێت، باشترین زەوین بۆ کشتوکاڵ. دەشتە لافاوکردەکانی ناوەڕاست و باشوری عێراق کە دیجلە وفورات دروستیانکردووە لەم جۆرە دەشتانەن .

### ج- شێوە باوەشێنیەکان:

ئەوجۆرە دەشتانەن کە لە دامێنی چیاکاندا پەیدادەبن، لەو جێگایەدا کە چیاکەی دەگاتە پادەشت، چونکە ئەو ئاوە خوڕانەی بە گۆڕ لە چیاکەوە دێتە خوارەوە، کە دەگاتە پادەشتەکە ئیتر ئەو گوڕەی نامێنێ، کە هەمو لیتە و خڵتەکەی لەگەڵ خۆیدا ببات، بۆیە هەر زیخ و لم و خۆڵ و خڵتەیەکی لەگەڵ خۆیدا هێنابێت لە دەم پادەشتەکەی دامێنی چیاکە دەنیشێت و بەدرێژایی دامێنی چیاکە بەشێوەی باوەشێن ، لێرەو لەوێ دەشتیان لێ پەیدادەبێت و بەرەو پادەشتەکە لێژدەبنەوە.ئەم جۆرە باوەشێنانە لە دامێنی چیاکانی سنووری باشوری کوردستان، لەو ناوچانەدا کە دەشتە لیتەییەکەی عێراق دەگاتە ئەو چیایانە، بەزۆری هەن بەتایبەتیش لە ناوچەی مەندەلی و زرباتیە و بەدرە.

دەشتەکان بەگشتی بوونەتە مەلبەندی ژیان و گوزەران و ئاوەدانی لەسەر ڕووی زەوی، چونکە هاتوچۆیان تێدا ئاسانە وبەئاسانیش ڕووبەرێکی بەرفراوانی تێدا دەکرێتە کشتوکاڵ ومەکینەی گەورەی کشتوکاڵیش بێ گرێ ملی لێدەنێ و ڕێگاوبانی هاتوچۆش هیچ سەختییەکی نایەتەبەر و بە سانایيش جۆگە و جۆباری تێدا لێ دەدرێت و ئاوی پێدا ڕادەکێشرێت. بە پێچەوانەش هەرچی ناوچە شاخاوییەکان وسەختەکانە، ئەو کارانەی تێدا زۆر بە گران دەوەستێت و ماندووبونێکی زۆر زیاتریشی دەوێت.



پارچەیەکی سەردابڕی دەلتای باوەشێنی



دەلتایەکی باوەشێنی

### هۆکارەکانی پەیدابوونی بەرزی و نزمی:

ڕووی توێکڵی زەمین و هەرچی چیا وبان ودەشت و دۆڵێکی هەیە، هەمووی بەدوو جۆرە هۆکار پەیدابوون،جۆرێکیان بریتیە لە چالاکی و تەکانی (ناوەوەی) زەمین کە چەمانەوە و شکان و گڕکانەکان وبوومەلەرزە و فوارە گەرمەکان دەگرێتەوە.جۆرەکەی تریان هۆکاری (دەرەوەی) زەمین کە با و ساردی و گەرمیی هەوا و ئاوی خوڕ و ڕووباری سەهۆڵبەندان و شەپۆل و تەوژمی دەریا دەگرێتەوە.

وا بە کورتیش یەکە بەیەکەی ئەم هۆکارانە باس دەکەین:

#### ١- هۆکارەکانی ناوەوە:

ڕووی زەمین وەنەبێ پابەندی ناوەوەی نەبێت و لێی تەریك بێت، بگرە هەر تێکچوون و تەکانێکی بەتین وتاوی ناوەوەی زەمین، جێکارەکانیان لەسەر ڕووەکەشی دەردەکەوێت، گرنگترین هۆکارەکانی ناوەوەش ئەمانەن:

### بوومەلەرزە:

لەرزینەوەی ماوە کورت وخێراخێرای زەمینەو تووشی هەندێ پارچەی توێکڵی زەمین دەبێت،جاری وا هەیە ئەو لەرزینە ئەوەندە هێواش وکزن مرۆڤ هەستیان پێناکات،واش هەیە ئەوەندە بەهێزن زیانێکی زۆریان لێ پەیدا دەبێت.

### گرنگترین هۆی ڕوودانی بوومەلەرزەش ئەمانەن:

١- قڵیشان و شکانی توێکڵی زەمین، کە دەبنە هۆی ئەوەی چینەکان یەکنەگرن و بەیەکەوە چەسپ نەبن بەو هۆیەوە لایەکی دادەکەوێ یان هەرەس دێنیَو، لاکەی تری وەکو خۆی دەمێنێتەوە وهیچی لێ نایەت، لەمەشەوە لەرزەینەوەی ماوە جیاواز وخێرا وکزی جۆریەجۆر پەیدادەبێت.

٢- جاری واش هەیە لە تەقینەوە و دەرپەڕینی بەتینی ماددە تواوەکانی گڕکانەکان پەیدا دەبێت، کە جێکار و شێوەی جۆریەجۆر وئاشکرا بەسەر ڕووی زەوییەوە بەجێ دەهێڵێت.

گڕکانەکان لە پێکهێنانی ڕووی زەویدا کارێکی گەورەیان هەیە، چونکە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا،لەوانەیە لەچەند ڕۆژێك یان چەند حەفتەیەکدا گۆڕینێکی زۆر لەبەرزی و نزمی ڕووی زەمیندا دروست بکات، وەکو ئەوەی لە باشووری مەکسیك قەوما، لەوێ گڕکانەکەی (جۆرلۆ) کە تەقی، لە ماوەی مانگێکدا بەو ماددە ڕەق وتواوە جۆربەجۆرانەی کە دەریدا قووچەکێکی دروستکرد بەرزاییەکەی گەیشتە نزیکەی (٥٠٠)مەتر . خۆ ئەگەر هاتوو ناوچە چرووگەکانی توێکڵی زەمین، واتا ئەو جێگایانەی تووشی قڵیشان وشکان

وترازان دەبن، یان بەشێکیان دادەکەوێ، گرکانیان لە بندا هەبوو، ئەوا بە ئاسانی ئەو ماددە قەتیسماوانەی ناویان لەو جێگا چرووکانەوە کەلێنێك دەدۆزنەوەو لێوەی سەردەردەکەن بۆ سەر ڕووی توێکڵی زەمین.

بەڵام ئەو تەکان و بزوتنەوەی کە بەسەر ڕووی توێکڵی زەمیندا دێت و، تووشی گرژبونەوەو چەمانەوەو تێکشکانی دەکات و، چیا و بان و دۆڵی لێ پەیدا دەکات، ماوەیەکی زۆری پێ دەچێت و، ملیۆنەها ساڵ دەخایەنێت.

هەرچی فوارە گەرمەکانە، هیچ کارێکی ئەوتۆیان لە پێکهێنانی ڕووی زەمیندا نییە.

٢- هۆکارەکانی دەرەوە:




ئەم دوو وێنەیە جێدەستی داماڵکاریی هەواو بایان تێدادیارە

بەرزی و نزمی ڕووی زەوی وە نەبێ تەنیا هەر بە هۆکارەکانی ناوەوەی پەیدابببێت، بگرە هۆکاری دەرەوەش هەن کە ڕووی زەوی دەگۆڕن، یەکێکیان :

هۆکاری هەوایە (الجو): کە کار لە تاوێرەکانی توێکلی زەوی دەکات و هەڵیاندەوەرێنێ.ئەم کارتێکردنەشی دوو شێوازە، شێوازێکیان (کیمیاکارییە) کە ڕەگەزە جۆربەجۆرەکانی ئەو تاوێرانە شی دەکاتەوە و دەیانگۆڕێت، شێوازەکەی تریان (میکانیکییە) کە تاوێرەکان هەڵدەوەشێنێ و هەڵدەوەرێن، بەڵام ڕەگەزەکانیان هیچ گۆڕانکاریەکیان بەسەر نایەت.

أ- کاری کیمیاکاری هەوا: لەو جێگایانەدا زۆر بەهێزە کە بارانیان زۆرە، باراناو لە ووردە هەناسەکانی تاوێرەکانەوە دزەدەکات بۆ ناو تاوێرەکان و ئەو ماددانە دەتوێنێتەوە کە جۆشی پێ خواردوون و وەهایان لێ دەکات کەبە ئاسانی تووشی داماڵین ولێك هەڵوەشانەوە بن. ئەم کارەش گەلێ بە ئاشکراتر لە تاوێرە کلسییەکاندا دەردەکەوێت، چونکە باراناو بڕێکی زۆری دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی هەوا دەتوێنێتەوەودەبێتە تێکەلێکی سووکی ترشی کاربۆنیك وئەوکاربۆناتی کالسیۆمەی کە تاوێرە کلسییەکانیان لێ پێکدێت هەموویان دەتوێنێتەوە،بەڵام کەمترکارلەبەردەئاگرینەکان دەکات.

ب- کاری میکانیکی هەوا (الجو): کاری جۆربەجۆری میکانیکی هەوا بە گوێرەی ئاووهەواکە دەگۆڕێت.ئەم کارە لەوجێگا ووشکانەی کە گەرماگۆرکێیەکی زۆر لەنێوان گەرمی ڕۆژ و شەویدا هەیە، واتا لەو جێگایانەدا کە دووهەوان، ڕوونەو بە ئاشکرا دیارە،چونکە بەرۆژ لەو جێگایانەدا کە زۆر گەرمە بەهۆی کاری تیشکی ڕۆژەوە، پلەی گەرمی بەرزدەبێتەوە کانزاکانی ناو تاوێر و بەردەکان دەکشێنێ، بەڵام بەشەو کە پلەکانی گەرمی نزم دەبنەوە کانزا کشاوەکان دەچنەوەیەك، لەبەر ئەوەش کە تاوێرەکان لە

کانزای جۆربەجۆر پێکهاتوون و هەریەکەشیان پلەی کشانی لەویتریان ناچێت و جیاوازن، ئەوا تاوێرەکان هێزی یەکگرتنیان نامێنێ و بەرەبەرە دەقڵیشێن و تێکدەشکێن و دەکەون.



ئەم وێنەیە شوێنەواری داماڵکاریی هەواو با دەنوێنێ

### داماڵکاری هەوا (الجو) لەمانەدا دەردەکەوێت:

(١) یارمەتی پێکهاتنی بەرزی و نزمی ڕووی زەوی دەدات بەوەی کە چینە چرووکەکان لێك هەڵدەوەشێنێ و ووردیان دەکات یان شییان دەکاتەوە و دەیانتوێنێتەوە و، چینە سەرت و ساغەکانیش کە داماڵکاری کەمێك کاری تێکردوون قووچ، بەبەرزی دەمێننەوە.

(٢) خۆڵ و خاك دروست دەکات.

(٣) ڕێگا بۆ هۆکاری تری باو ئاوی خوڕ و شەختە و سەهۆڵ وشەپۆڵەکان خۆش دەکات کە تاوێرەکان دابخۆن و دایانماڵن، چونکە بەبێ ئەم هۆکارانە، هۆکاری هەوا بەتەنیا، سستە، ئەم هۆکارانە نەك هەر تاوێرەکان دادەخۆن و دادەماڵن، بگرە پارچە ووردەکانیشیان دووردەخەنەوە، جا بە ئاو بێ، یا بە

با یان بە سەهۆڵ، لە کوێ نیشتن بەرەبەرە کۆمەڵ دەبن و شێوەی تازەتر لەسەر ڕووی زەوی پەیدا دەکەن.

ئەم هۆکارانەی دەرەوە لە ڕووی شێواز و جێگای داماڵکاریەکانیانەوە وەکو یەك نین و جیاوازن، ئەو ئەنجامانەش کە لێیانەوە پەیدا دەبێت دیسان جیاوازن،بۆ نموونە: بایەکان، بەتایبەتیش بای بیابانەکان هۆکارێکی بەهێزی پەیداکردنی هەندێ دیاردەی خۆرسکن لەو بیابانانەدا، مێزی بیابان و تەپۆلکی باکردی لم و شتی تریش لەو دیاردانەن. (سەیری وێنەکان بکە).

ئاوی خوڕیش هۆکارێکی تری دروستکردنی دیاردەکانی ڕووی زەمینە چونکە چیاکان دادەخواو دایاندەماڵێ و شێوو دۆڵی قووڵ و گەورە هەڵدەکەنێ و دەشتی گەورە و پان و بەرین پەیدادەکات. ڕووبارەکانیش بێ گومان لە باران یا بەفر یا لە هەردووکیان پەیدا دەبن،کە سێڵاوەکانیان بەرەو نشێوی کۆدەبنەوە و جۆگەی بچووك پەیدا دەکەن و ئەم جۆگانەش یەك دەگرنەوە و شیوەڵ و چەماویان لێ پەیدا دەبێت و نشیۆ بە نشیۆ دەڕۆن تا هەموو بەیەك دەگەن و ڕووباری گەورە دروست دەکەن.


وێنەی مێزی بیابانەو بە داماڵکاریی بایەکان پەیدابووە


وێنەی تەپۆلکە لمەکانە لە با بەجێ ماون ونیشتون

## ڕووباره سه‌هۆڵبه‌ندانه‌كان:

ڕووباره سه‌هۆڵبه‌ندانه‌كان كارێكی گه‌وره‌له ڕووی توێكڵی زه‌مین ده‌كه‌ن، هه‌روه‌ك له چاخه سه‌هۆڵبه‌ندانه‌كاندا ڕوویدا، له‌وانه‌یه سه‌هۆڵه‌كه شێوه‌ی كه‌ڤه‌رێكی فراوان وه‌ربگرێ له‌و ناوچانه‌ی كه پله‌ی گه‌رمییان گه‌لێك له پله‌ی سفر كه‌متره،كه هه‌ردوو جه‌مسه‌ره‌كه‌ی زه‌وی وكێڵگه به‌فرینه هه‌میشه‌ییه‌كان لای چیابه‌رزه‌كان ده‌گرێته‌وه.دیارده‌ی ڕووباری سه‌هۆڵبه‌ندان زۆرن، فیۆرده‌كان ودۆڵه هه‌ڵواسراوه‌كان و گردبووه‌وه (ركام)ی دامێن و بن وته‌نیشته‌كانی ڕووباره سه‌هۆڵبه‌ندانه‌كان، له‌و دیاردانه‌ن.




ئه‌م دوو وێنه‌یه لێژبوونه‌وه‌ی سه‌هۆڵبه‌ندان ده‌نوێنن

## شه‌پۆڵ و ته‌وژمه‌كانی ده‌ریا

هۆكارێكی گرنگن كه‌شێوه‌ی ڕووی زه‌مین ده‌گۆڕن،له‌و ناوچانه‌دا كه یه‌كسه‌ر كه‌وتوونه‌ته كه‌نار ده‌ریا وزه‌ریاكانه‌وه،له‌م جێگایانه‌دا شه‌پۆڵ و

تەوژمی دەریا گەلێ دیاردەی جۆربەجۆری وەکو کەنداوو تاق ومیلی دەریاکردوپێچ وپەنا ونووکەبەردی لەدەریاوە سەردەهێناو دروست دەکەن.

### مرۆڤ وگیانلەبەران:

جاروبار کارێکی ئەوەندە خێراوفراوان لە ڕووی توێکڵی زەمین دەکەن کە لەهی هۆکارەکانی تری دەرەوەی زەمین زیاترەو، مەگەر بە دەگمەن ناوچەیەکی ڕووی زەوی هەبێت دەستی گۆڕانکاری ئادەمیزادی بەرنەکەوتبێ،ئەوەش کە ئادەمیزاد دەیکات لە ڕێی ئەوەدایە کە خۆراکی لێ دەستبکەوێت ودوارۆژێکی باشتر بۆ خۆی و وڵاتەکەی برەخسێنێ، لەبەرئەوەیە کە ئادەمیزاد هەوڵ دەدات دەست بەسەر سروشتدا بگرێت و دارستانە سروشتیەکان ببڕێت وزەوی وزاری کشتوکاڵ زیاد بکات وپڕۆژەی ئاودێری سازبدات وڕێگاوبانی هاتوچۆوگواستنەوە بکێشێت وزەوی هەڵبدرێت وکانەکان بدۆزێتەوەوکانزاکانیان لێ دەربهێنێ و پوختیان بکات.

بەم جۆرە مرۆڤ گەلێ دیاردەی تازە و تازەتر لەسەرڕووی توێکڵی زەوی پەیدا دەکات، هەروەها گیانلەبەرانی تریش.

هۆکاری تریش هەن کەئەوکۆلینکاری وداماڵینە لەجێگایەکدا خێراتر دەکەن ولەجێگایەکی تردا ڕێگا نادەن بەوخێراییە کاری خۆیان بکەن، ئەمانەن:

### ١- جۆری تاوێرەکان:

ئەوانەی ڕەق و سەرت بن زیاتر بەرگەی کۆڵینکاری و داماڵین دەگرن لەو تاوێرانەی کە پووك و چروکن.

## ٢- لێژی ڕووی زەوی:

هەتا زیاتر لێژ بێت تاوێرەکانی زووتر هەڵدەوەشێ و هۆکاری داماڵینیش زیاتر کاریان لێدەکات لەچاو زەوییە تەختاییەکان.

٣- ئەو ماددانەی کە (با و ئاوی خوڕ و شەپۆڵەکان) هەڵیانگرتووە هەتا زیاتر و قورستر بن زۆرتر و زووتر ئەو تاوێرانەی کە دەکەونە ڕێگایان ئامێر کارانە دایاندەتاشن.

## ٤- پۆشاکی ڕووەکی:

ڕەگەکانی چنگ لە گڵەکە گیردەکەن و زیاتریان بەیەکەوە چەسپ دەکەن، لەبەر ئەوە کەمتر داماڵین و داتاشین کاری لێ دەکات.

بە کورتیش ئەو هۆکارانەی ناوەوە و دەرەوەی زەمین کە بەردەوام بەرزی و نزمی لەسەر ڕووی زەمین پەیدادەکەن، هەموویان پێکەوە شانبەشانی یەکتر دیاردەکانی ڕووی زەمین دروست دەکەن.



ئەمە وێنەی فیۆردە

# بەشی چوارەم

## ژیانی سروشتی سەر ووشکانی و ژیانی کشتوکاڵی

### ١- ڕووەکی خۆرسك:

ڕووەکێکی زۆر و هەمەجۆر ڕووی ووشکانی داپۆشیوە، کە لەخۆیەوە ڕسکاوە و دەستکردی مرۆڤ نییە، کە (ڕووەکی خۆرسك)ی پێ دەڵێن. هەرچەندیشە مرۆڤ لەم ڕووەکە خۆرسکە سودێکی زۆری پێ گەیشتووە و لەوەڕگا و سامانی داری بەکار هێناوە و لە گەلێکی تریش خۆراکی خۆی و لەوەڕی ئاژەڵی دەست کەوتووە، کەچی لە لایەکی ترەوە ڕەفتاری ئەوتۆی کردووە کە بووە بەهۆی گۆڕین وتێکدانی ڕووبەرێکی بەرفراوانی زۆری پۆشاکی ڕووەککردی زەوی، بەتایبەتیش دارستانەکان. مرۆڤ زۆربەی زۆری ئەم دارستانانەی بڕیوە بۆ ئەوەی جێگاکانی بکات بە جۆرە کشتوکاڵێك کەڵکی زۆرتری بۆی هەبێ، چونکە کشتوکاڵ لە ژیانی مرۆڤدا بایەخێکی گەورەی پەیداکردووە. لەو هەموو دارستانە خۆرسکانەش ئەوەی کە ئێستا ماوەتەوە، تەنیا دارستانی ئەو ناوچانەیە کە دەستی مرۆڤی پێ نەگەیشتووە و، جارێ کاری پێ نەبووە،دەنا دارستانی زۆربەی ناوچەکانی تر بنەبڕ کراوە و نەماوە.

ژیانی ڕووەکی کە شین ببێت وگەشەبکات لەهەرهەرێمێك لەئەنجامی ئاوێتەبوونی چەند هۆکارێکی سروشتییە، کەدەبێتە هۆی چڕی وجۆراوجۆری ودابەشبوونی ڕوەکە خۆرسکەکە ،لەدیارترین ئەم هۆکارانەش کەکارێکی بەتینی لە ڕەخساندنی ڕووەکی خۆرسکدا هەیە، هەلومەرجی

ئاووهەوایە کە بریتییە لەبڕی باران وپلەی گەرمی، هەرجۆرە ڕووەکێکیش پێویستییەکی تایبەتی خۆی بە ئاو هەیە و ئەگەر ئاوەکەی لەوە زیاتر یان کەمتر بوو، گەشەناکات یا بە تەواوی ووشك دەبێت.

هەروەها پلەی گەرمی ئەگەر لە پێویستی ئەوجۆرە ڕووەکە زیاتر یان کەمتر بێت هەڵدەپروکێت یان زیاد ناکات،ئەم کەمترین یان زۆرترین ڕادەی پلەی گەرمییەش، هەر یەکەو، بۆ جۆرە ڕووەکێك بەکەڵکە و بۆ هەموو ڕووەکەکان چونیەك سودی نییە، بۆنمونە ڕووەکی ئەو ناوچانەی گەرمییان مامناوەندە، پلەی گەرمی لە ١٥°– ٣٠°س دەبێت،هەرچی ڕووەکەکانی ناوچە گەرمەکانیشە لەپلەی گەرمیی زیاتر لە ٣٢° س دا چاکتر پێ دەگەن.

بارانیش کارێکی بەتینی لەجۆراوجۆری وچڕی رووەکی خۆرسك دا هەیە،چونکە بارانی زۆروپلەی بەرزی گەرمی ڕوەکی چڕ پەیدا دەکات،دارستانەکانی ناوچەی کەمەرەی زەمین(هێڵی یەکسانی)یش بەڵگەیەکی ئاشکرایە،بەڵام بارانی کەم وپلەی بەرزی گەرمی لەبیابانەکاندا ڕووەکی دڕکاوی و پەرشوبڵاو دەرەخسێنێت،هەرچی ئەو ناوچانەشە کە کەم باران وپلەی گەرمیان نزمە جۆرە گیایەکی لاوازیان لێ شین دەبێت، کە (گیای ئەستێپس)ی پێدەڵێن.

بەرزی ونزمیش دیسان کارێکی ئاشکرای لە جۆراوجۆری و چڕی ڕووەکی خۆرسك دا هەیە، ئەودۆخەش لەناوچە بەرزاییەکان هەرلەبناری شاخەکانەوەتا دەگاتە لوتکەکانیان بەتەواوی دیارە، بۆنموونە لەبنار ودامێنەکانی چیا وبەرزاییەکانی ناوچە خولگەییەکاندا ڕووەکی ناوچە

گەرمەکان (واتا دارستانە خولگەییەکان) زۆرەو،هەتا زیاتریش بەو بەرزاییانەدا هەڵگەڕێین، ئەوجۆرە دارستانانە بەرەبەرە کەم دەبنەوە ونامێنن ئنجا دارستانی گەلاڕێز دەست پێدەکات، بەرەو ژورتریش ئەوا دارستانی سنەوبەریە،لەوەش ئەگەر زیاتر هەڵگەڕێین ئیتر دارستانە سنەوبەریەکانیش دوایی دێت و دەگەینە ڕووەکی وورد وورد کە بریتین لە قەوزە،لەوەش بەرەو ژوورتر لە کۆتاییدا ئیتر کێڵگەی هەمیشە بەفرە، ئەم پلەبەپلە جۆراوجۆرەی ڕوودانی ڕووەکەش بە دامێن وبەرسنگەکانی باشووری چیاکانی هیمالایاوە دیارە، هەروەها لەچیاکانی ناوەڕاستی ئەفریقیاشدا هەیە،لەوانەشە لاپاڵی هەندێ چیاش کەم ڕوەك بن، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە ووشکن وکەوتوونەتە بەر (سێبەری بارانەوە).

خاکیش لەودابەشبوونەی ڕووەکەکاندا کاری خۆی هەیە، چونکە پێکهێنەرەکانی خاك لە جێگەیەکەوە تا جێگەیەکی تر جیاوازن، هەرێمی تایبەت بە گژوگیای وەها هەیە دارستانیشی لێ پەیدا دەبێت چونکە خاکەکەی قورەشینە و ئاو گلدەداتەوە، کەچی بە پێچەوانەوە هەندێ خاك لە هەرێمە باران زۆرەکانیشدایەو، گیای لێ شین دەبێت، کە دەبوو دار دایپۆشێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو خاکە هەناسەدارە (مسامیة). جا لەبەرئەوە خاك لە جیاوازیی ڕووەکی خۆرسکدا جێکاری دیارە. دەشتوانین ئەم کۆمەڵە ڕووەکانەی خوارەوە کە بە ڕووی زەوییەوەن، بخەینەڕوو:

## ١- دارستانەکان: بریتین لە:

أ- دارستانەکانی کەمەرەی زەمین(هێڵی یەکسانی).

ب- دارستانی خولگەیی.

ج- دارستانی گەلاڕێز.

د- دارستانی سنەوبەری.

## ٢- گیا: بریتییە لە:

أ- گیای درێژ وبەرز (سافانا).

ب- کورتە گیای (ئەستێپس).

## ٣- ڕووەکی بیابان (ڕووەکی دڕکاوی).

## ٤- ڕووەکی تەندرا.




نەخشەی دارستانەکانی کەمەرەیی ونیمچە کەمەرەیی زەوی وگیای سافانا

### ١- دارستانەکان:

دارستانەکان بەگشتی دەکرێن بەم پۆلانەی خوارەوە:

#### أ- دارستانەکانی کەمەرەی زەمین (هێڵی یەکسانی):

ئەم دارستانانە ئەو ناوچە نزمە باران زۆرانە دەگرێتەوە کە کەوتوونەتە نێوان هەردوو بازنەی پانی ( ٥ ) ی باکوور و باشووری هیلی کەمەرەی زەوییەوە، ئەم ناوچەیەش بە درێژایی ساڵ بارانی زۆری لێدەبارێت ولە (١٠٠٠ملم) زیاترە وتێکرای پلەی گەرمی رۆژانەشی لە ساڵدا دەگاتە (٢٧-٢٩) پلەی سەدی.

ئەم دارستانانە لە ئەمریکای باشوور حەوزی رووباری ئەمەزۆن و، لە ئەفریقیاش حەوزی رووباری کۆنگۆ وکەنارەکانی غانای داپۆشیوە. دارەکانیشی هەمیشە سەوز وگەڵاپانن و پۆپەکانیشیان تێکەڵاون و پێکداچوون، پەنجا مەتریش بەرزدەبنەوە، جاروبار دەگەنە هەشتا مەتریش. چڕی ئەم دارانە بە جۆرێکیشە کە ناهێڵن تیشکی خۆر بگاتە زەوییە پڕ لە زەلکاو و پر لە ئاوەڕۆکانیان. ئەم دارستانانەی کەمەرەی زەمین کۆمەڵە رووەکێکی خۆهەڵواسی زۆریشی تێدایە، لەبەرئەوە دارەکانی کەڵکی ئەوەی نییە کە دەرامەتی تەختەی لێ وەدەست بێت، بەڵام کۆمەڵە رووەکێکی وەهاشی تێدایە کە لە رووی ئابورییەوە بەسوودە، وەکو داری لاستیك و مۆز و کیتا و لوببان (کندر) و دارخورمای رۆندار و کاکاو. لە گەلێ ناوچەی وەکو ئەندەنوسیا و فلیپین و کەناراوەکەی خۆرئاوای بانی دکن هەندێ لەم دارستانانە براون و جێگاکانی کراوە بە کێڵگەی روەکی ئابووری وەکو چای و قاوە و قامیشی شەکر.



ئەمەش وێنەی دارستانی کەمەرەییە دارەکانی براوەتەوە وکراوەتە کێڵگەی کشتوکاڵی.

ب- دارستانی خولگەیی: لە ناوچە خولگەییەکاندا زۆرە کە بەزستانان ووشك و هاوینیان باراناویە،ڕووەکی ئەم ناوچانە هەمیشە سەوزنین و لە وەرزە ووشکەکەی زستاندا گەڵایان دەوەرێت، دارەکانیشی زۆرتر شاشن و وەکو هی دارستانەکانی کەمەرەی زەمین چڕ نین و وەکو ئەوانیش بەرز نین، بۆیە تیشکی خۆر بە باشی دەگاتە زەوی وبن دارەکان و گژوگیا و دەوەنیشی لێ پەیدابووە، ڕووەکی هەڵگەڕاو و خۆهەڵواسیش لە ناو ئەم دارستانانەدا کەمترە لەوەی کە لە دارستانەکانی کەمەرەی زەمیندا هەیە. گرنگترین دارەکانیش داری (سنگ) و حەیزەرانە و، برنج و قامیشی شەکر و مۆز و خورمای ڕۆندارو گەنمەشامی و قاوەشی لێ دەکرێت.

ج- دارستانی گەڵاڕێز: گەڵای ئەم دارانە بە زستان لەبەر سەرما و نزمبوونەوەی پلەی گەرمی، دەوەرێت، دارەکانی ڕەق وسەرتن کە بەهایەکی ئابووری گەورەیان هەیە.لە دارەکانیشی داربەڕوو،دارگوێز، گێوژ،ئەسپیندار.ڕووبەرە زەوییەکی بەرفراوانی ئەم دارستانانە دارەکانی

براون بۆئەوەی جێگاکانن بکرێن بەکشتوکاڵ و بەروبوومی ڕووەکی تر کە لە ڕووی ئابوورییەوە سوودی زۆرترە، بەڵام لە وولاتانی ژاپۆن وچین وباشووری شیلی دا ئەم دارستانانە ماون و دەستکاری نەکراون.

د- دارستانی سنەوبەری:



ئەم نەخشەیە ناوچەکانی دارستانی سنوبەری نیشاندەدات

ئەم جۆرە دارستانانە (دارستانی قوچەکی)یشی پێ دەڵێن، دارەکانی قەدی ڕاستەو گەڵاکەی باریك، وەك دەرزی وایە، ئەم دارستانانە دەکەونە بازنەکانی پانی نیمچە سارد (مام ناوەند) و، ساردی زەمینەوە، کە تیشکی خۆری تێدا کزە، لەبەر ئەوە زەوی ئەم دارستانانە ستەمە گیای لێ شین ببێت. داری (شەربینی دۆگلاس) گرنگترینی دارەکانییەتی کە لە (٢٥٠)پێ زیاتر بەرزدەبنەوە، هەندێکیش لەم دارستانانە براون و جێگاکانی کراون بە پەرش (الشیلم) و کاڕس (شۆفان) و کەتان.



ئەمەش وێنەیەکی دارستانی سنەوبەریە ( کاژە )

٢- گیا: گیا به دوو جۆر (پۆل) دانراوه كه ئه‌مانه‌ن:

أ- ساڤانا: ئه‌م جۆره‌یان گیای درێژه و به‌رزه، كه له ناوچه‌ی شێداره خولگه‌ییه‌كاندا،له نێوان بازنه‌ی پانیی ٨-١٨ی باكورو وباشووری كه‌مه‌ره‌ی زه‌میندا شین ده‌بێت،ئه‌م ناوچانه‌ی به هاوین باران ده‌یانگرێته‌وه‌و ئه‌م جۆره گیایه‌یان به چری لێ په‌یدا ده‌بێت، به‌ڵام رووبه‌رێكی به‌رفراوانی ناوچه‌كانی ئه‌م گیایه پاك كراوه‌ته‌وه و كراوه به كێڵگه و كشتوكاڵ، زۆرترین پشتێنه‌ی گیای ساڤانا له‌كیشوه‌ری ئه‌فریقیادا هه‌یه، جگه له‌و ناوچانه‌ی ئه‌فریقیاش هه‌ندێ ناوچه‌ی تری جیهانیشی داپۆشیوه‌و له‌هه‌ر ناوچه‌یه‌ك له‌و ناوچانه‌دا به ناوێكی تره‌وه به‌ناوبانگه، ئه‌وه‌تا له ئه‌مریكای باشووردا (كه‌مبۆس) ی پێده‌ڵێن كه له‌وه‌رگایه‌كی زۆر به‌ناوبانگه، له باكووری ئوسترالیاشدا هه‌یه، به‌ڵام جێگایه‌كی كه‌م و ته‌نگی لێ داپۆشیوه.



ئه‌م دیمه‌نه گیای ساڤانا ده‌نوێنێت

ب- کورتە گیای ئەستێپس: ئەم گیایە کورتەو لە ناوچە مامناوەندییەکانی بازنەی پانیدا شین دەبێت، ئاووهەوای ئەم ناوچانەش نیمچە ووشکەو بارانی ساڵانەشی لە (١٠٠ملم) کەمترە و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا وناوەڕاستی ئاسیای گرتۆتەوە.



ئەم نەخشەیە ناوچەکانی کورتەگیای ئەستێپس نیشاندەدات

## ٢- ڕووەکی بیابان:

ئەم ڕووەکانە دڕکاوین و،ڕووبەرێکی بەرفراوانی بیابانەکانی جیهانی گرتۆتەوەو دیاردەیەکە لە ناوچەیەکی پان وبەرینی بیابانە گەورەکەی ئەفریقیا وبیابانەکەی نیمچە دورگەی عەرەب وبیابانی کەلەهاری و ئەتاگاما و بیابانی (ثار)دا هەیە، دیارە ئەم ڕووەکە دڕکاویانە بە جۆرێکی ئەوتۆ ڕسکاون کە دەتوانن بەرگەی ووشکیی بیابان وگەرماوتێنوێتی بگرن و بنەمای گونجانیان لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا بەئاشکرا پێوە دیارە، ئەوەتا هەندێکیان گەڵا وورد و باریکن (گەڵاکانیان وەکو دەرزی وایە)، هەندێکیشیان گەڵاکەی دەوەرێت، هی تریان هەیە گەڵاکەی خۆی بە توێژاڵیکی مێوین سواغ دەدات، هی تریشیان هەیە گەڵاکانی توێژاڵێك کەمتر خوێی پێوەیە کە بەم هۆکارانەوە

ئارەقەو هەڵمینیان بەڕۆژ کەمتر دەبێت وشەوانیش شێ وتەڕاییان باشتر بۆ دەمژرێت چونکە جۆری وایان هەیە بە ساڵەها گەشەیان دەوەستێت تا دووبارە بارانێکیان لێدەداتەوە، ئەوجا دووبارە گەشەدەکەنەوە و گەڵادەکەن.

### ٤- ڕووەکی تەندرا:

ڕووەکێکی گیاییە لە وەرزی هاوینی کورتی ئەم هەرێمە دەوەرێ، تەمەنی لە سێ مانگ تێپەڕ ناکات، ئەم گیایە بەسەر زەوی پاڵ دەکەوێ وخۆراکی هەندێ ئاژەڵی ناوچەکەیە وەکو ئاسکی(ڕەنە).



ڕووەکی بیابان

### ٣- ژیانی کشتوکاڵی:

أ- کشتوکاڵ: هەموو کردارێکی کێڵان و تۆوکردن و ئاوداشتن و دروێنەو فرۆشتنی بەرووبومەکانیشی دەگرێتەوە کە جوتیار دەیانکات. ڕووبەری هەموو زەوییە کشتوکاڵیەکانی جیهانیش بە ٣٦٠٠ ملیۆن دۆنم (فەدان) خەملێنراوە، ئەم ڕووبەرەش نزیکەی ١١٪ی هەموو ووشکانی جیهانە، بەڵام ئەو زەویانەی کە بۆ کشتوکاڵ لەبارن سێ ئەوەندە دەبێت. کشتوکاڵ پیشەیەکی سەرەکییەو ٥٢٪ی دەستی کارگەر(پاڵە)ی پیشە جۆراوجۆرەکانی هەموو جیهان کاری تێدادەکەن و پێوەی خەریکن.

کشتوکاڵ چەند شێوەیەکەو بیرۆکەی هەر شێوەیەکیان لە ئامانجەکەیەوە دەزانرێت،یەکێك لەم شێوانەی کشتوکاڵ (کشتوکاڵی بژێوی)یە کە لە هەندێ ولاّتانی تازەپێگەیشتوو،و هەندێ جێگای کەنارگیر ولاچەپدا هەیە، شێوەیەکیان کە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ئێستاش هەر ماوە (کشتوکاڵی جێگۆڕکێی بژێوی) پێدەلێن .شێوەی دووەمی کشتوکاڵی بژێوی پێی دەڵێن (کشتوکاڵی بژێوی چڕ)، ئەم شێوەیەدەستی کارگەر (پاڵە)ی زۆری تێدا دەخرێتە کار و لەو جێگایانەدا هەیە کە دانیشتوانی زۆر و جەنجاڵە. قەبارەی کێڵگەی لەم شێوەیە بچوکە، بەڵام دەتوانرێت بەهۆی بەکارهێنانی پەیینەوە(بەتایبەتی پەیینی ئاژەڵی) بەروبومی ئەوەندە زۆر بکرێت کە بچوکیەکەی پێوە دیارنەبێت.

شێوەیەکی تری کشتوکاڵ هەیە پێیدەڵێن (کێڵگەی کشتوکاڵی بازرگانی) کە ئامێری تازەبابەت و تۆوی چاکتر و پەیینی کیمیاوی و شێوازی خولی کشتوکاڵی تێدا دەخرێتەکار و بەروبوومی زۆر بۆ بازرگانی بەرهەم دەهێنێ وەکو لۆکە و چا و کاکاو و لاستیك و مۆز.



ئەمەش دیمەنی کشتوکاڵی چرە

### ب- ئەرکەکانی جوتیار:

ئادەمیزاد لە سەرەتای کشتوکاڵدا وولاغی خستەکار بۆ جووتکردنی زەوی و کێڵگەی پێ سازکرد،دوای ئەوەش کە ئامێری میکانیکی گاسنکێش و تۆوەشێن، و درەوکەری داهێنا، لە جیاتی وولاغ بەکاری هێنا.

بەم جۆرە دەتوانین بڵێین کە زۆربەی ئەرکەکانی جوتیار لە ناو کێڵگەکاندا بە کورتی ئەمانەن:

١- جووتکردن (کێڵان).

٢- پەیین کردن.

٣- ئاودێری.

٤- بژار و شی کردنەوە.

٥- دروێنە.

٦- بۆ بازاڕ بردن.

## ڕێگاکانی ئاودێری وداشوشتن و پرۆژەکانیان

ئاودێری: ڕێگەکانی ئاودێری کە کشتوکالی پێ دەکرێت بریتین لەمانە:

١–ئاودێری بە باران.

٢– ئاودێری شێوە ئەستێلکی.

٣– ئاودێری بەردەوام (بە ئامراز، بەراو).

### (١) ئاودێری بەباران (دێمی):

واتا زەوییە کشتوکاڵەکە دێمەکارە و باران ئاوی دەدات ئەگەر لە کاتی پێویستدا بۆی برەخسێت، لەبەرئەوە کشتوکاڵی دێمەکار پێویستی بە جۆگەلێدان و تۆڕی ئاوبەشکردن نییە. ئەم جۆرە ئاودێریە لەزۆر لەناوچەکانی کوردستان دا باوە.

### (٢) ئاودێری شێوە ئەستێلکی:

ئەم جۆرە ئاودێرییە لە زەوی دەرووبەری ئەو ڕووبارانە دەردەکەوێت کە ئاوی لافاویان لەو زەویانە بەرزتر دەبێتەوە، لافاوەکە ئەو زەویە چاڵانە پڕ دەکاتەوە لیتە و ئاومالْکێکی زۆریشیان تێ فرێدەدات، بێ گومان ئەو زەویانە تێر ئاو دەبن و کاتێکیش بۆ کشتوکاڵ ئامادەی دەکەن، بەری ئاوەکەی بەردەدەن و ڕێگای بۆ دەکەنەوە بڕوات و ئیتر ئاودانی تری ناوێت. ئەم جۆرە ئاودێرییە لە میسر لەمبەر و ئەوبەری نیل دا بەکاردێت. هەروەهاش لە ناوەندە حەوزی ڕووباری دیجلە و فوراتیشدا بەکاردێت.

### (٣) ئاودێری بەردەوام:

ئەمجۆرە ئاودێریە لە ناوچەیەکدا پێویستی بە ئاوی بەردوام هەیە، کەبە هۆی جۆگەکارییەکی تۆڕئاساوە ئاوبگاتە کێڵگەکان ولەڕێی داشۆرکاریشەوە ئاوی زیاد لە کێڵگەکانەوە دەربکرێت وبڕوات. ئەم جۆرە ئاودێریەش دوو جۆرە: أ- ئاودێری بە ئامراز ب- ئاودێری بەراو.

#### أ- ئاودێری بە ئامراز:

ئەم جۆرە ئاودێرییە لەناوچەیەکدا دەبینرێت کە ڕووی ئاوی ناو جۆگە و ڕووبارەکانی لە زەوییەکان خوارتر واتا نزمتر بێت، لەبەر ئەوە پێویستە ئاو لە چالاییەوە بۆ ئەو زەوییە بەرزانەی گوێ ئاوەکە سەر بخرێت، ئەم کارەش پێویستی بە ئامرازی وەکو (ئاوسەرخەر) هەیە، بە بەکارهێنانی ئاو سەرخەریش ئاوێکی زیاتر سەردەخرێت و کێڵگەکانی ئەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکە تا ماوەیەکی دیاری کراو ئاودەخواتەوە، ئەم جۆرە ئاودێریە لە ناوچەکانی باشوری کوردستان لە هەردوو شانی ڕووبارەکاندا دەبینرێت.



وێنەی جۆرێك لە ئاوداشتن

ب- ئاودێری بەراو:

ئەمجۆرە لەو ناوچانەدا دەکرێت کە ئاوی جۆگەکان لە زەویە کشتوکاڵیەکان بەرزترە و ئاوەکە بۆ خۆی لە جۆگە گەورەکانەوە دەچێتە ناو جۆگە بچکۆڵەکان و لەوانیشەوە دەچێتە سەر کێڵگە کشتوکاڵیەکان، تەنیا ئەوەی دەوێت کە جۆگە گەورەکان بە ڕێکخەری ئاو دابڕدابڕ بکرێت بۆئەوەی ئاو بە ڕێکی بەسەر جۆگە بچکۆڵەکاندا بەش بکرێت. ئەم جۆرە ئاوداشتنە لە باشوور و ناوەڕاستی عێراقدا زۆرە.

پرۆژەکانی ئاودێری:

پرۆژەی ئاودێری ئەو کارە هونەری و خزمەتگوزاریانەیە کە بە شێوەیەکی ڕێك وپێك و بەدڵنیایی ئاو دەگەیەنێتە زەوییە کشتوکاڵیەکان.

**بەگشتی دوو جۆرن:**

١- بەنداوەکان ٢- عەماراوەکان

١- بەنداوەکان:

بەنداو بەربەستێکە لە ئاوەڕۆی ڕووباردا بۆ ڕێکخستنی ئاو دادەمەزرێت، چەند دەرگایەکیشی تێدا هەیە، بە جۆرێکی ئەوتۆ دەست بەسەر ئاوەکەدا دەگیرێت کە لە بەرابیەوە ئاوەکە بە بەرزییەوە ڕادەگیرێت، تا بە ئاسانی ئاو بگەیەنێتە ناو ئەو جۆگانەی کە لە ژوور بەنداوەکەوە بەمبەر و ئەوبەری ڕووبارەکەوە هەڵگیراون، هەروەکو بەنداوی کوت کە لە ئاوەڕۆی دیجلەدا دامەزراوەو ئاو دەگەیەنێتە ناو جۆگەی دۆجێلە و غەڕاف. بەنداوی هیندییەش کە لەسەر فوڕات دامەزراوە جڵەوی کەمی و زۆریی هەردوو شەتاوی حللە و هندییەی بەدەستەو ئاویش بۆ ناو هەردوو جۆگەکەی حوسەینیە و بەنی

حەسەن سەردەخات، هەروەها بەنداوەکەی دیالە کە لەسەر ڕووباری سیروان (دیالە) دامەزراوە و ئاوەکە بۆ ناو جۆگەکانی خالس و ڕۆژ و سارییە و مەهرووت و هارونییە و میقدادیە و جۆگەکەی مەندەلی سەردەخات.

### ٣- عەماراوەکان:

عەماراوەکان لە ڕێی زیادە ئاوی لافاوەوە پەیدادەبن و لەکاتی بێ ئاویشدا سوودیان لێ وەردەگیرێت، بە دامەزراندنی بەنداویش لە ئاوەڕۆی ڕووبارەکاندا ئاوی زیادە گلّ دەدرێتەوە و عەماردەکرێت، وەکو بەنداوی دەربەندیخان کە لە بەر زێی سیروان دا دروست کراوە، لە میسریش (سد العالي) لەبەر ڕووباری نیل ئاوەکە دەکاتە سەر دەریاچەی ناصر.

عەماراو جگە لە سوودی بۆ کشتوکالّ سوودی تریشی هەیە، هێزی کارەبای لێ پەیدا دەکرێت و ماسیی تێدا زۆردەکرێت و جێگایەکی خۆشیشە بۆ گەشت وسەیران .




نەخشەی پرۆژە ئاودێرییەکانی ناو عێراق

## پرۆژەکانی داشوشتن:

داشوشتن بریتیە لە دەردانی ئەو ئاوەی لە بەرووبوومەکە زیادە، ئەم ئاودەردانەش بە دامەزراندنی تۆڕێك لوولەی داشۆرگە دەکرێت کە هەموو ناوچەی کشتوکاڵەکە بگرێتەوە. داشوشتنی خاك گەلێك گرنگە، چونکە جگە لە دەردانی ئەو برە ئاوەی کە لەپێداویستی رووەك زیادە بگرە زەوییەکەش لەخوێ پاکدەکاتەوە وخەسلەتی خاك بەهێزدەکات وتوانای بەرهەمهێنانیش زیاد دەکات:

دوجۆرە پرۆژەی داشوشتن هەیە:

١- داشۆرگە کراوەکان

٢- داشۆرگە داخراوەکان(داپۆشراوەکان)

# بەشی پێنجەم

## جوگرافیای هەرێمە ووشکەکان

### هەرێمە ووشکەکان بە هەردوو بەشەکەیەوە

### ئەستێپس و بیابانەکان بە گوێرەی پۆلینەکەی کوبن

ئاووهەوا بە شێوەیەکی کاریگەر سیفات وتایبەتمەندییە سەرەکییەکانی هەرێمە ووشکەکان سەبارەت بە خەسڵەتەکانی ڕووی زەوی وڕووەك وئاژەڵ وخاك وجۆری ژیان وسنوورەکانی ئاووهەواو بیابانەکان وزەوییەکانی ئەستێپس (السهوب) دەستنیشان دەکات،ئەوەبوو (کۆبن) لە ساڵی ١٩١٨دا بە سوود وەگرتن لە ئامارەکانی تایبەت بە باران توانی ئەو سنوورانە دەستنیشان بکات. لە پرۆژەی پۆلینکاریی ئاووهەوادا، سنوری شێداری بیابان، لەو ناوچانەدا کە بە درێژایی ساڵ بارانیان بە شێوەیەکی ڕێك وپێك لێ دەبارێت، بەهێڵی بارانی چونیەکی ٢٠سم ی دانا، لەو کاتەدا کە ناوەندەگەرمی ساڵانە لە نێوان (٥°– ١٠°س)دا بێت،کەچی هێڵی بارانی چونیەك لەچوارچێوەی ناوەندە گەرمیی(٢٥°س)ی ساڵانە دا بێت بە ٣٢سم. لەبەر ئەوە لێواری شێداری ئەستێپس کاتێك کە پلەی گەرمی (١٠°س) بێت دەکەوێتە چوارچێوەی هێلی بارانی (٤٠)سم، کە پلەی گەرمیش گەیشتە (٢٥°س) هێڵی بارانی دەبێتە ٦٤سم. بارانی وەرزە ساردەکان کارێکی زیاتر دەکات وەك لەو ناوچانەی کە پلەی گەرمیان بەرزە، چونکە ئەو بارانەی کە بەهۆی گەرمی و هەڵمانەوە لە بارانەکانی وەرزە ساردەکان وون دەبێت کەمترە لە بارانەکانی وەرزە گەرمەکان ، ڕووەکیش بەدەگمەن دەبینرێت کە ئەمەش بەڵگەی تینی ووشکییە.

هەروەها شوێنەواری دیاردەی ووشکی لەسەر ئەو شێوەی ژیانەشدا دەردەکەوێت کە لەو هەرێمانەدا باوە.



زەوییە ووشکەکان

### دابەشبوونی جوگرافی هەرێمەووشکەکان بە گوێرەی پۆلینکاریەکەی کۆبن:

کیشوەر نییە لە جیهاندا کە ناوچەی بیابانی (هەرێمە ووشکەکان)ی نەبێت، هەرێمە ووشکەکانیش چەند ڕووبەرێکی بەرفراوانی ڕووی زەویان داگیرکردووە. جا بۆ ئەوەی جێگاکانیان دەستنیشان بکەین، دەتوانین ئەو پلە گەرمییەی لەو هەرێمە ووشکانەدا هەیە بکەین بە بناغەی ئەم دابەشبوونە، لەسەر ئەم بنچینەیەش بیابانەکان دەکرێن بە دوو جۆرەوە:

١- بیابانە گەرمەکان　　　　٢- بیابانە ساردەکان

### ١- بیابانە گەرمەکان:

بیابانە گەرمەکان ئەو ناوچانەیان داگیرکردوە کە بە شێوەیەکی سەرەکی تەوژمی هەوای داکەوتووی پەستانبەرز بەسەریاندا زاڵە، بەوەش هەلومەرجیان بۆ داباربن لەباروگونجاو نییە، لەبەرئەوە دەتوانرێت بیابانەکان

وەها دابنرێن کە کەوتوونەتە چوارچێوەی ناوچەی بای بازرگانی، وەك بیابانی گەورە و بیابانی ئەتەگاما و کەلەهاری و بیابانی خۆرائاوی ئوسترالیا.
لە سیفاتی ئاووهەوای ئەم بیابانە گەرمانەش ئەوەیە کە پلەکانی گەرمی رۆژانە و سالآنە زۆر لەیەك دوورن (واتا دووهەوان)، لەوانەیە ناوەندە پلەی گەرمی لە مانگی کانونی دوەمدا (١٣°س) بێت، کەچی پلەی نزمی گەرمی تا (-٧°س) دادەبەزێت، ناوچەی بیابانی (تامان ڕاست) لە جەزائیر، وەهایە،هەر لەوناوچەیە ڕادەی بەهەڵم بوون زۆربەرزە لەکاتێکدا شێی ڕێژەیی نزم دەبێتەوە بۆ ٩،٥٪ ،هەرچی تێکڕای بارانی سالآنەشە دەمدەمییە (متذبذب).

لە (تامان ڕاست)دا (بیابانە گەورەکە-جەزائیر)، لەماوەی یەك سالّدا ١٥٨ملم واتا نزیکەی (٦،٢گرێ) باران باری، کەچی لەساڵێکی تردا نزیکەی ٦،٤ ملم، واتا (٠،٢٥گرێ) باران باری، جارێکیشیان لە تامان ڕاست لە ماوەی ٣ سەعاتدا نزیکەی ٤٤ملم باران باری کە ئەمەش بریتی بوو لە ٣/٤ی هەموو بارانی ئەو ساڵەی تامان ڕاست، لە سایەی دۆخێکی نالەباری وەهادا، بەبێ ئاودان ستەمە کشتوکاڵ بکرێت، بگرە ئەو لەوەڕگایانەش کە هەن دیسان لە سایەی هەلومەرجێکی سەختی ئاووهەوای وەهادا مەترسیی زۆریان لێ دەکرێت، چونکە بارانی ئەوەندە کەمە کە گرانە گیای لێ شین ببێت، سەرەڕای ئەوەش پلەی بەرزی گەرمی هەوای سەرزەویەکە زۆر داخ دەکات چونکە ئەو گەرمییە بەجۆرێکی ئەوتۆ تاو بە تاوێر و لمی ئەو بیابانە دەستێنێت کە لەبەر خۆری دوای نیوەڕۆدا پلەی گەرمی لە (٨٢°س) تێدەپەڕێت، ئەم تینی گەرمایە جێگا سێبەرەکانیش دەگرێتەوە، لەبەر ئەوە ڕووەکی ئەوێ لەگەڵ هەلومەرجی ووشکیدا خۆی گونجاندووە، ئەوەتا

هەندێك لەو ڕووەكانە گەڵایان دەوەرێت تا كرداری ئاودەردانیان كەمتربێت، جاری واش هەیە گەڵای ئەو ڕووەكانە بەچینێك خویێ خۆیان سواغ دەدەن تا بتوانن بە شەو ئەو كەمە شێیەی لە هەوادا هەیە بیمژن. ڕووەكی واشی تێدایە سواغێكی مێوین گەڵاكەی دادەپۆشێت كە ڕێگای ئاودەردانیان بە تەواوەتی دەبڕێت یان زۆر كەمی دەكاتەوە.



نەخشەی دابەشكردنی بیابانە گەرمەكان

## ٢- بیابانە ساردەكان:

كاریگەری ووشكیی دەگاتە ناوچە ووشكانییەكانی بازنەكانی پانی ناوەراستیش،ئەم ناوچانەش بریتین لە باكووری ئاسیا و باكوری ئەمریكای باكوور، چونكە ئەم دوو ناوچەیە فراوانترینی ناوچە ووشكەكانی ئەو بازنە پانیانەن. هۆی ووشكی ئەو ناوچانەش بەوە دانراوە كە بەرزایی بڵند دەوری داون و نایەڵێت هەوای تەڕ و شێداریان بگاتێ، ئەو هەوایەش كە دەگاتە ئەوێ هەوایەكی ووشكە چونكە هەوای داكەوتووە (هابطة). هۆیەكی تریش هەیە كە ئەو ناوچانە ووشكن، ئەویش ئەوەیە كە ئەو ناوچانە لەو جۆرەن كە تەوژمی هەوای داكەوتوی ساردیان بۆ دەچێت، ئەمەش نایەڵێت هەوای

تەریان بگاتێ، لەبەر ئەوە پلەی گەرمی لە زستاندا (-١°س) دێتە خوارەوە و لەوانەشە زوقم بیگرێت و دوورنییە بەفریی لێبباریت، ئەوەتا لە شاری تاشقەند (ئۆزبەکستان) تێکڕای گەرمی مانگی کانونی دووەم دەگاتە (-١,٢°س) لەوانەشە لە کاتی شەپۆڵە ساردەکاندا بگاتە (-٣٠°س). هەرچی بەفریشە لەوانەیە بەردەوام تا ٢٧ ڕۆژ ببارێت. ئەم بارە لەوانەیە لە ناوچەکانی ناوەراستی ئاسیادا ڕووبدات چونکە زۆربەی بیابانی ئەوێ لە سنووری باکورییەوە بەزرایی دەوری نەداوە، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە زستانان بە ئاسانی تەوژمە ساردەکانی هەوا تێ پەڕێت و بگاتە ئەو ناوچە ووشکانەو پلەی گەرمیی تێدا ئەوەندە نزم بکاتەوە تا پلەی بەستن (التجمید)،لەوانەشە ماوەی ڕوودانی زوقمیش تا ١٥٢ ڕۆژ درێژە بکێشێت. هەرچی وەرزی هاوینانیشە لەو ناوچانەدا زۆر گەرم و ووشکە و لەوانەشە پلەی گەرمی بگاتە ٤٣°س. لە ناوەڕاستی ئاسیاشدا، لە لەکشۆن، تا پلەی گەرمی ٤٨°س تۆمارکراوە. گەلێ هۆکاری خۆجێیی وەك سامالّی ئاسمان و بێ ڕووەکی زەویش دیسان پلەی گەرمی بەرزتردەکەنەوە.



وێنەی بیابانە ساردەکان

## کاریگەری ئاووهەوا لە هەرێمە ووشکەکان:

سیفەتی باڵادەست(غالب)ی ئاووهەوای هەرێمە ووشکەکان کەم بارین و بەرزی پلەی گەرمی و زۆریی هەڵمانە، واتا ئاووهەوای ووشك ئەوەیە کە هەڵمانی لە داباریینی زیاترە، بەوەش دەبینین کە رووبەرێکی فراوانی زەوی ئاووهەوای ووشکی بەسەردا براوە کەلەوانەیە ٣/١ی رووی زەوی بگرێتەوە. لێکۆلەرەوەکان هۆی ووشکی ئەو هەرێمانە دەگەڕێننەوە بۆچەند بنەمایەك، دەڵێن زۆر دووری ئەو هەرێمانە لە دەریاوەو نەگەیشتنی کاری شێی دەریاکان بەو هەرێمانە یەکێکە لەو بنەمایانە، سەرەڕای ئەوەش زۆربەی ئەو ناوچانەش بەتەواوی کەوتوونەتە ناوەوەی کیشوەرەکانەوە، لەبەرئەوە ئەو بایەی بارانی پێوە بێت کەمی دەگاتە ئەویّ و ئەو کەمەش کەڵکی ئەوەی نییە کشتوکاڵی تێدا بکرێت یان ژیانێکی بەپێز بۆ رووەك برەخسێنێت. چەند بەشێکی تر هەن لەم هەرێمانە کە بەرزایی دەورەی داون و بەری ئەو بایەی لیّ گرتوون کە لە دەریاوە بەرەو وشکانی هەڵدەکات، ناوەراستی ئاسیا وەهایە، چونکە چیاکانی تیانشان و چیای پامێر بەری ئەو بایە شێدارەیان گرتووە کە لە زەریای ئەتڵەسییەوەدێت ونایەڵیّ بەناو بیابانی(زنجاریا)دا بڕوات. چیاکانی هیمالایاش رێگەیان لە گوژمی ئەو وەرزە بایە شێدارانە گرتووە کە لە زەریای هیندییەوە دێت و بەلای ڕۆژئاوادا لادەدات و دەگۆڕێت و دەبێت بە بای داکەوتوو، ئەمەش بوتەهۆی ووشکیی ناوچەکانی بیابانی سەند و (ثار) و بلوجستان لە باکووری خۆرئاوای هیندستان. هەروەهاش بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵاتی ئوستراڵیا نایەڵن گوژمی بای باشووری ڕۆژهەڵات بگاتە ناوەوەی کیشوەرەکە و ئەمەش ڕووبەرێکی زۆری بە ووشکی هێشتۆتەوە.

سەرەڕای ئەو بنەمایانەی باسکران، بنەمای تریش هەن کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە خولانەوەی باگشتیەکان هەیە وبونەتە هۆی ووشکی،ئەوەتا ئەو ناوچانەی پەستانی بەرزیان وەرزیە تووشی ووشکەساڵی وەرزی دەبن وەکو ئەو دۆخەی کە زستانان لە ناوەوەی کیشوەرەکاندا ڕوودەدات. ئەو ناوچانەش کە پەستانی بەرزیان بەردەوامە ، تووشی ووشکەساڵی بەردەوام دەبن، وەکو ئەو دۆخەی لە بیابانی گەورەی ئەفریقیا و بیابانی عەرەب و هی ئەتەگاما لە ئەمریکای باشوور و بیابانی کەلەهاری لە باشوری خۆرئاوای ئەفریقیا و بیابانە گەورەکەی ئوستڕاڵیا هەیە.

ناوچەی واش هەیە نزیکن لە کەناری دەریاوە کەچی لە هەموو ناوچەیەك ووشکترن هەرچەندیشە دەریا بە سەرچاوەی شێ دادەنرێت، وەکو ئەو دۆخەی لە دورگەکانی (کوانۆ)دا هەیە کە کەوتونەتە نزیك کەناراوەکانی (پیرۆ)، هەروەها ئەو کەناراوانەش کە کەوتوونەتە باکووری خۆرئاوای ئەفریقیاوە و بارانی ساڵانەشیان لە (٥°س) کەمترە، هۆی ووشکی ئەو ناوچە کەناراوییە ڕۆژئاواییانەش ئەوەیە کە لە نزیك ئەم کەناراوانەوە تەووژمی ساردی دەریا تێپەڕ دەبێت و شێی هەواکە خەست دەکاتەوەو هەر لەوێدا باران دەبارێت پێش ئەوەی بگاتە کەناراوەکان، لەبەر ئەوە ئەو تەوژمە ساردانە بەهۆکاری ووشکی ئەو ناوچانە دادەنرێت.

### دەرامەتی ئاو لە زەوییە ووشکەکاندا:

ئاو لە ناوچە ووشکەکاندا شتێکی گرنگ و زیندووبەخشە چونکە کار لە دابەشکردن و چڕیی ڕووەکی خۆڕسك وگیانلەبەر ومرۆڤیش دەکات، ئەگەر ناوچە ووشکەکان ئاویان لێ بێت دەبن بە ناوچەیەکی لەبار بۆ چالاکیی ئابووری. سەرچاوەی دەرامەتی ئاویش لە ناوچە ووشکەکاندا ئەمانەن:

١- ئاوی ژێر زەوی.

٢- ئاوی ڕووباری بەردەوام کە سەرچاوەی ئاوەکانیان کەوتۆتە جێگا شێدارەکانی دەرەوەی سنوری (ناوچە ووشکەکە) بەڵام هەر لە (چوارچێوەی هەرێمە ووشکەکەدا) لە بەرزاییە شێدارەکانەوە دەردەچێت. هەرچی ئاوی ژێرزەویشە لەو ناوچانەدا کۆدەبێتەوە کە زەوییەکەی تاوێری چین چینەو باشترینیشیان ئەوەیە کە لمکارە، ئەم جۆرە ناوچانە دوای ئەوەی ئاوەکان لە ڕووی زەوییەکەوە دەچنە خوارەوە، دەبن بە کۆگای ئاو، وەنەبێ زۆربەی ئاوی بارانیش بگاتە چینە کۆکەرەوەکانی ئاو، چونکە دۆخی سەختی هەڵمان و خێرایی ئاو کە بەسێڵاوو بەخوڕ دەڕوات و دەرفەتی ئەوەی پێ نادەن کە بچێتە ناو زەوییەکەوە، کەمێکی نەبێت کە ئەو کەمەش بە نزیکەی ٤-٥٪ی هەموو بارانی ساڵانە دەخەملێنرێت، ئەم دۆخەش لە بیابانی کەلەهاریدا دیارە. هەرچی تونسیشە ساڵانە نزیکەی ٢٢,٥ هەزار ملیۆن م٣ ئاوی بارانی بەردەکەوێت بەڵام لە ٥٪ی زیاتر ناگاتە ناو زەوی.

ئاوی ژێرزەوی لەوانەیە بەشێوەی کانی وسەرچاوە لەچینە کۆکەرەوەکانی ئاوەوە بەهۆی گەرمی تاوێری کانییە ئاگرینەکانەوە بەرەو ژوور بجووڵێن و هەڵبقوڵێنە سەر ڕووی زەوی، یان لەجێگاکانی ناتەواویی جیۆلۆجییەوە سەردەکات، یان لە درز وقڵیشی زەوییەوە دەردەکەوێت، جاروباریش لە ئەنجامی داڕووتان ونەمانی چینە تاوێرەکانی سەر کۆگا ئاوەکانی ناو زەوییەوە، ئاوەکە دەردەکەوێت،جاری واش هەیە پێویستە بیری بۆ لێ بدرێت و ئاوەکە بە ترومپا سەربخرێت. جا بۆئەوەی کە چینە تاوێرە ئاوگلدەرەوەکان بەشێوەیەکی ڕوون بخەینەبەرچاو، دەتوانین بەردی لمکار لە هەموویان بە چاکتر لەقەڵەم بدەین چونکە ڕێژەی بەتاڵییە پڕ لە

ئاوەکانیان دەگاتە ١٠٪. بەردی لمکار لە گەلێ ناوچەی ووشکی جیهاندا بە سەرچاوەی ئاو دادەنرێت، وەکو بەردە لمکارەکانی ئوسترالیا و میسر. ئاو لە بەردە لمکارەکانەوە لە سەعاتێکدا ٨٠٠–١٠٠٠م٣ی لەبەر دەڕوا، ئەگەر لێژایی چینە بەردە لمکارەکان لە ئاستی رووی ئاوەکەی ژێر زەوی کەمتر بێت ئەوا لە درز وداشکاوەکانەوە سەر دەکات ودەبێت بە کانی، وەکو ئەوانەی لە مێرگە (واحە)کانی (داخیلە و خاریجە و سیوە)ی میسردا هەیە. ناوچەی تاوێرکاری واش هەیە بە شێوەیەکی سەربەخۆ ئاوەکان کۆدەکاتەوە وەکو ناوچەکانی نیمچە دورگەی عەرەب و سودان کە ئاستی ئاوەکانی ناو زەوی لەم ناوچانەدا رێکوپێك نییە، بگرە لەو بیرە ئاوانەشدا کە لەیەك جێگادان، چونکە چینە گلدەرەوەکانی ئاوی ناو زەوی لەو ناوچانەدا بە شێوەیەکی ئالۆز پێکدا چوون. ئەگەر بشیانەوێت لەم ناوچانەدا ئاو بۆ مەبەستی ئابووری بەکاربێنن ئەوا پێویستە ئامرازی وەها بخەنەکار کە بتوانێت بگاتە ناو ئەو چینە تاوێرەی کەئاوەکەی گلداوەتەوەو کۆگای ئاوی لێ پەیدابووە.بەکارهێنانی ئاوی ناو زەوی لەسەر کەم وزۆری دەرهێنان وئەو یەدەگەشی وەستاوە کەلە کۆگا ئاوەکەدا هەیە، لەبەرئەوە ئەگەر ئاوەکەی بە زۆری دەربهێرێت و بۆ هەموو پێداویستێکی ئاودێری و ئاودانی گیانلەبەر و پێداویستیی تری مرۆڤ بە زۆری بەکاربهێنرێت، ئەوا زوو ئاستی ئاو لە بیرە ئاوەکاندا دادەکەوێت و ئەوجا دەبێت دووبارە بیرەکان قووڵتر بکرێن، ئەم کارەش ئابووری نییە. جا لە پێناوی ڕابەرکاری بەکارهێنانی (ترشید الاستعمال) ئاوی ژێر زەویدا دەبێت ئەوە بزانین کە ئاوەکە کەم و زۆر چەندە، کە بەپێی ئەوە دەست بەکاربکرێت، چونکە ئەو ئاوەی لە

بیرەکانەوە دەردەهێنرێت ڕێژەیەکی کەم دێتەوە جێی کە ٣٠/١ی ئاوە کارکراوەکەش نابێت.

هەرچی سەرچاوەی دووەمی ئاویشە لە هەرێمە ووشکەکاندا ئەوە ئاوی ڕووبارە بەردەوامەکانە،ئەوەبوو ڕووباری دیجلە وفورات ونیل وسەند لە جیهانی دێریندا ئاوی تەواویان بۆ دامەزراندنی شارستانێتی کشتوکاڵ دابین کرد، ئێستاش چەند بەشێکی زۆری دەرامەتی ساڵانەی ئاوی دیجلە وفورات بۆ پێداویستی کشتوکاڵ و ئاودانی گیانلەبەر و پێداویستیەکانی تری مرۆڤ بەکاردێت. سوودوەرگرتنیش لەئاوی ڕووبارەکان بەرژێمی ڕەهاکردنەوە بەندە کە ئەویش کەوتۆتە ژێر کاری دۆخی هەواو باری هەڵمان و چونی ئاوەکە بۆ ناو زەوی. هەوڵ و کۆششێکی زۆریش ئەوە هەر بەردوامە بۆ ڕێکسختنی گڵدانەوەو و پاشەکەوتکردنی ئاوی ڕووبارەکان، کە باراناوەکان لە عەمباراودا بەجۆرێك گڵ بدرێنەوە کە دووبارە بۆ کاتی پێویست بتوانرێت ئاوەکەی بکرێتەوە سەر ئەو ڕووبارانەو بۆ ئاودێرییەکی بەردەوام سودی لێ وەربگیرێت. بەڵام ئەوەش هەیە ئەم عەمباراوانەش دووچاری چەند گیروگرفتێکی سەرەکی دەبن کە بریتین لە پڕبوونەوەی بنکەکانیان بە ئاو ماڵك و نیشتەمەنی و، ئاوێکی زۆریشیان بە کرداری هەڵمان و بەهۆی دزەکردنی ئاوەوە لێ کەم دەبێتەوە. هەر چۆنێك بێت، ئەو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەی ناوچە ووشکەکانی گرتۆتەوە، بەشێوەیەکی سەرەکی بەستراوە بە چەند و چۆنیی ئەو ئاوەی کە لەوێ بە ئاسانی دەست بکەوێت، ئینجا ئەو ئاوە ئاوی کانی بێت یان هی ڕووباری لەبەر ڕۆیشتووی بەردوام بێت.

## مێرگەکان:



وێنەی مێرگ

مێرگ بریتیە لەوخاکە بەپیتەی کەبەهۆی بوونی ئاو بە بیابان دەوردراوە بەمەش بۆتە جێگەی نیشتەجێبوونی مرۆڤ و لەوەراندنی مەڕومالآت وئاژەڵ وکشتوکاڵکردنیش .مێرگەکان بوونەتە مۆڵگە بازاڕ و شمەکی ئەو کاروانانەیان تێدا ئاڵوگۆڕ دەکرێت کە ڕێیان دەیکەوێتێ. سەرەڕای ئەوەش ئاوی کانی و بیراوەکانیشی بۆ هەندێ جۆرە کشتوکاڵ کە لە گەڵ ئاووهەوای ئەو مێرگانەدا گونجاوە سوودی لێ وەردەگیرێت، بۆنموونە مێرگە گەرمەکانی بیابان بە باغی خورما ناوبانگیان دەرکردووە لە ژێر سێبەری دارخورماکانیشدا ڕەزە مێو و داری هەنجیر و قەیسیش دەچێندرێت جگە لەوانە کشتوکاڵی بەرووبوومی تری وەکو گەنم و جۆ و پەمۆ(لۆکە)ش دەکرێت. لەگرنگترین ئەو مێرگانەش لە ولآتە عەرەبیەکان وەك (سیوە، داخیلە، خاریجە، فرافرە، عەینوتتەمر و فەززان).

## وەبەرهێنانی زەوی هەرێمە ووشکەکان:

مرۆڤ دوای بەکارهێنانی ئامرازی تازەبابەت لە کردارەکانی کشتوکاڵ و سوود وەرگرتن لە دەرامەتی ئاو ، ئنجا دەستی دایە وەبەرهێنانی دەرامەتی ئاوو زەوییەکانی هەرێمە ووشکەکان ،دەستکەوتنی ئاوو بڕی ئاو لەو هەرێمە ووشکانەشدا بووە بنەمای تەشەنەکردنی پارچە زەوییە کشتوکاڵیەکانی، بەڵام گیروگرفتی کەمیی ئاو لە هەندێ لەو هەرێمە وشکانەدا ئەوەیە کە ئاو وەنەبێ هەر بۆ فراوانکردنی پارچە زەوییە کشتوکاڵیەکان پێویست بێت، بگرە بۆ کردارەکانی دەرهێنانی کانزاکانیش زۆر پێویستە،ئەوەتا ئاو بۆ دەرهێنانی کانزا گرانبەهاکان لە ناوچەکانی وەکو کۆلۆرادۆوکالیفۆرنیا لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا،وبۆ دەرهێنانی ئاسن لە بیابانی گەورەی ئەفریقیا بایەخی هەیە.

هەرچەندە کێشەی بڕی ئاو لەناوچە ووشکەکاندا کێشەیەکی سەرەکی وبەردەوامە،بەڵام گەرانی بەردەوام بۆدۆزینەوەی ئاوو بەکارهێنانی شێوازی تازەی ئاودێری ودڵۆپاندنی ئاوی سوێر،ئەمانە هەمووی بۆ بوژاندنەوەی ناوچە ووشکەکان لەرێی پەرەپێدانی ئەوناوچانەدا بەکارێکی گرنگ دادەنرێت،دەوڵەتە پێشکەوتووەکانیش لەوەبەرهێنانی زەوییە ووشکەکانیاندا شێوازی زانیاریانەو تەکنەلۆژییان خستۆتەکار. لە ناوچە ووشکەکاندا رووبەری لەوەڕگاکان لە ڕووبەری کشتوکاڵە بەراوەکان زۆر زیاترە،زۆریشی پێ ناچێت کە لەوانەیە ئەو لەوەڕگایانە بەتەواوەتی ببنە ڕووتەن، چونکە گیایەکەی هەموو تەڕایی خاکەکە دەمژێت وتەواوی دەکات وشوانەکان ناچار دەبن بکەونە گەڕان و،لێرەولەوێ بەدوای لەوەڕدا عەوداڵ بن وناشتوانن لەسەرچاوەی ئاوەکانەوە لەوناوچە ووشکانەدا زۆر دووربکەونەوە وپێویستە بۆئاودانی ئاژەڵەکانیان لێیانەوە نزیك بن.

زۆربەی دانیشتوانی ئەوناوچانەش بیابانی کۆچەرن کەژمارەیان لە بیابانەکانی عەرەبدا خۆی لە (٧٥٠,٠٠٠) کەسێك دەدا،نیمچە بیابانی یان نیمچەشوانییش هەرلەو ناوچانەدا لەدووملیۆن زیاترن،ئەوەبوو لەوەپێشیش باسمان کرد کە گەرانی ئەو خەڵکە لەسەر دەرامەتی ئاوو لەوەڕی ناوچەکە بەندەو بەشێوەی کۆمەڵی بچووك بچووك لە جێگایەکەوە بۆجێگایەکی تر خەریکی کۆچڕەون، جاری واش هەیە لەسەر ئەو دەرامەتە کەمانە ناکۆکی دەکەوێتە نێوان کۆمەڵێك و کۆمەڵێکی تریانەوە و ناکۆکییەکەش درێژە دەکێشێت و بەردەوامە، گەلێ جاریش شوانەکان گوێ نادەنە سنووری نێوان دەوڵەتان و بەدوای ئاوولەوەڕدا لەو سنوورانە دەپەڕنەوەو ئەم کارەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی ناکۆکی لە نێوان دەوڵەتەکاندا کە ناچاردەبن لە نێوان خۆیاندا بۆ نەهێشتنی ئەم ناکۆکیانە پەیمان ببەستن، هەندێ دەوڵەتیش ئەم کۆمەڵە شوانانەیان لە ژیانی بیابانگەری و کۆچەرییەوە هێناوەتە سەر ژیانێکی نیشتەجێ ونۆقرەگر، ئەم کردارەش پێویستی بە فەراهەم کردنی گەلێ خزمەتگوزاری وەك ڕاکێشانی ڕێگای هاتوچۆ وگواستنەوەی وەك هێڵی ئاسن و ،و دامەزراندنی وپرۆژەی ئاودێری هەیە، کە لە ژینگەیەکی ووشکی وەهادا گەلێك پێویستە هەبن بۆ ئەوەی بتوانن زەویی نزیك چەم و ڕووبارە بەردەوامەکان یان سەرچاوەکانی ئاوی ژێر زەوی بهێننەبەر. گەنم وجۆ وگەنمەشامی وهەرزنیش بەناوبانگترینی بەروبوومی کشتووکاڵی ناوچە ووشکەکانن، پاراستنی خاك و، نەهێشتنی بەفیڕۆچوونی ئاوو، بەربەست کردنی کرداری هەڵمین لە کشتوکاڵی ئەم ناوچە ووشکانەدا شتێکی زۆر گرنگە. هەرچی ناوچەکانی دەرهێنانی غازونەوتی بیابانی گەورەی ئەفریقیا و بیابانەکەی لیبیا وناوچەکانی کەنداوی عەرەبیشە کە لوولە نەوتەکانیان لێوە کشاوە تا دەگەنە بەندەرەکان، ئەم جێگایانەش بەهۆی وەبەرهێنانی ئەو کانزایانەوە دیاردەی ئاوەدانکردنەوە و

نیشتەجێبوونی بۆ ڕەخساوە. جگە لەوانە ناوچە ووشکەکان ناوچەیەکی لەبارن بۆ تاقیکردنەوە و هەڵدانی مووشەك چونکە ئاسمانیان ساماڵ وکەم هەورە. هەروەها بیابانەکان بوونەتە جێگای گەڕیدەوگەشتیار و ئەوانەی حەز بەتیشکی خۆر دەکەن،لەبەر ئەوە میوانخانەیان لێ دامەزراوە وحەسانەوەی تەواو بۆ ئەوانە دابین دەکەن وهەموو پێویستیەکیشیان بۆ فەراهەم دەکەن. بێگومان ئاوەدانکردنەوەی ناوچە ووشکەکان لەسەر ئاسانیی ڕێگاوبان و هۆوئامرازی هاتووچۆوگواستنەوە وەستاوە لەبەرئەوە کۆمپانیاکانی کانزاکردن ڕێگەیان تێدا راکێشاوە،بەنموونە کۆمپانیای کانەکانی کانزاکردن لە بیابانەکەی شیلی دا دوو جادەی ئۆتۆمبێلی ڕاکێشاوە تا بە ئاسانی و،بەبێ گرێ و ئاستەنگ هاتوچۆیان پێدابکرێت بۆ ئەو ناوچانە. هەروەها لە باکوری ئەفریقیاشدا لە ساڵی ١٩٦٢دا دوو ڕێگەی ئوتۆمبێل دامەزرا کە لە (حاسی مەسعود) دا، یەکدەگرنەوە، یەکێکیان لە شاری جەزائیرەوە دەردەچێت و، بە (حاسی ئەلرەمل) دا دێت و ئەویتریشیان هەر لە شاری جەزائیرەوە دەردەچێت و بە ناو (بەسکرەو تۆغۆریت)دا دێت. لەبەر ئەوە دامەزراندنی چەند شارێك لە بیاباندا، هەرچەندیشە دەرامەتی ئاوی کەمە بەڵام لەسەر کرداری دەرهێنانی کانزاکان وەستاوە، بۆ نمونە شاری ماریائەکینا ئاوو خۆراکی بۆ دەچێت چونکە ئاوو خۆراك لەو ناوچانەدا کەمە، هەروەهاش شاری کۆلجاردی بە بۆنەی دۆزینەوەی زێڕەوە پەیدابوو. لەبەر ئەوە بەکارهێنانی زەوی لە ناوچە ووشکەکاندا پێویستی بەوە هەیە کە هەلومەرجی گوزەرانی بەجۆرێك لێ بڕەخسێنرێت کە لەگەڵ ژینگەی گەرم و ووشکەدا بگونجێت و نەخۆشی و مێروو جڕ وجانەوەری زیانبەخشیشی لەناو ببرێت. زەوی ناوچە ووشکەکان لەگەڵ ئەوانەی کە باس کران دەشێن بشبن بە ناوچەی بەرهەمهێنی کشتوکاڵ و لەوەڕگاش.

## بەشی شەشەم

## جوگرافیای پیشەسازی

### پیشەسازی

ئادەمیزاد لەسەرەتاکانی ژیانییەوە پیشەسازی لەسەر زەمین کردووە چونکەلە بەرد دەمەتەوری تاشیوە ولە تەلزمی بەردی چیم دەمەچەقۆ و ولە قوڕیش تەنکە خشتی بۆ لەسەر نووسین و دەفریشی لێ دروستکردووە.

دوای ئەوەی ئاشنای کانزاکاری بوو یەك لە دوای یەك کانزاکانی دۆزییەوە، بە درێژایی سەردەمە یەك لەدوای یەکەکانیشەوە توانیی دەستکردەکانی خۆی باشتر بکات وهەمەجۆرە شتیان لێ دروست بکات ودەستیشی کرد بەدروستکردنی خشڵ وئامرازی تەور وشمشێر و ڕمی جەنگ وکەرەسەی جووت و هی دروێنە و دورینەوەی دانەوێڵەش.

ئنجا دەستی کرد بە بژارەو پاککردنەوەو ڕستنی خوری و جلوبەرگ و پۆشاکی خۆی لێ چنی وخۆی لەسەرماوسۆڵە ودووهەوایی پێ پاراست، بەوجۆرەهەندێ پیشەی ئاڵۆز لەپاڵ کشتوکاڵ وڕاوکردن وشوانی پەیدابوون کەبە پیشەسازی ناسرا، کاریشی بریتی بوو لە گۆڕینی ماددە خاوەکان کە(سەربەخۆ وبەو شێوەیەی کە هەبوون) هیچ سوودێکی ڕاستەوخۆی بۆ ئادەمیزاد نەبوو، بۆبارێکی ئەوتۆ کە لەگەڵێ ڕووەوەسوودی لێ وەردەگرت.لەمەوەبۆمان دەردەکەوێت کەپیشەسازی بریتیەلە((کرداری گۆڕینی ماددەکان لەبارە ڕەسەنەکەیەوە بۆشمەکی تازەی شێوەجیاواز کە بۆمرۆڤ بەسوودترەولەزۆربواری زیاتر حەزوپێویستییەکانی دابین دەکات)).

پیشەسازی وەکو پیشەکانی تر بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە **کەئەمانەن**:

## یەکەم: قۆناغی دەستکردی ماڵەوە:

لە چاخە دێرینەکاندا چالاکیی پیشەسازی سەربەخۆ و جیانەبووە، چونکە ژمارەی مرۆڤ لەو چاخانەدا کەمبووەو پێویستیشیان ساکار بووە و ئەوەندەش نەبووە. خێزانەکانیش شانبەشانی چالاکیی کشتوکاڵکردن و ڕاوکردن بە دەستی خۆیان ئامێر وئامرازی ساکاری پێویستی خۆیان دروستکردووە کاتێکیش زۆربوون پێویستیان بەشمەك زیادبوو، کەئیتر کەوتنە ئەوەی کۆمەڵ کۆمەڵ بژین وبەرووبومی خۆراکیان پتربو، لە خۆشیان زیاد مایەوە، ئەوسا چەند کەسانێکیان تێدا هەڵکەوت توانای دروستکردنی شمەکی جۆربەجۆریان تێدا ڕسکابوو کە بۆدابینکردنی هەموو جۆرە پێویستییەك ئەو شمەکانەیان بە دەست دروست دەکرد، بەوەش لە دروستکردنی ئامانی گلکار و ئامرازی جەنگ وتەونی خوری وکەتان و دروستکردنی خشڵدا جۆرە پسپۆڕیەك هاتەدی. بێگومان ئەو کەسانە بەو دەسترەنگینی وپسپۆڕییەوە لە شوان وجوتیارو ڕاوچی جیاوازیان بووەو خەڵکەکە ناسیویانن.بەوجۆرە یەکەم چینی خاوەن پیشە لەکۆمەڵدا هاتەکایەوە.ئەوکارگانە ئیتر خۆیان ئەو کەرەسەخاوانەیان پەیدادەکرد کەبەکاریان دەهێنا وبەدەستی خۆیان ئەو شمەکانەیان لێ دروست کرد کەشارەزاوپسپۆڕبوون لە پیشەسازیەکەیدا،شوێنی کارو بەرهەمهێنانەکەو دروستکردنەکەش هەمووی ماڵەوە بوو هەربۆیە بەم قۆناغە دەوترێت (قۆناغی دەستکردی ماڵەوە).

کاتێکیش بازاڕەکان پەرەیان سەند و گەورەبوون وپەیوەندی و هاموشۆی نێوانیان دەستی پێکرد،چینێکی بازرگان پەیدابوون ولەگەڵ خاوەن پیشەکاندا دەستیان کرد بە کارکردن لەگەڵ یەکتریدا، بۆ نموونە، دەچوون

کەرەسەی خاوی خووریان پەیدادەکرد ودەیاندا بەو ماڵانەی کەدەتوانن بیڕێسن، ئەوانیش دەیانڕست و دەیانکرد بە بەن و بە داو، یان دەچوون بەن و داویان کۆدەکردەوە وبەسەر ئەو ماڵانەدا بەشیان دەکرد کە دەتوانن تەونی بکەن وبیکەن بەقوماش.ئنجا بازرگانەکە دەگەڕایەوە بۆئەوەی داهاتەکەیان لەگەڵ دابەش بکات ،هەتا ئێستاش هەندێ شێوەی ئەم قۆناغەی پیشەسازیە لە چەند وڵاتێکدا ماوە ،وەك پیشەسازی ئاوریشم لە یابان و دروستکردنی عەبا و بەڕە و حەسیر لەهەندێ گوندی عێراق.

## دووەم: پیشەسازیی ئامێرکار:

ئەو شمەکانە داواکاریان زۆر بوو وژمارەی دانیشتوانیش زیادی کردو ئاستی خۆشگوزەرانیش پێشکەوت،بەتایبەتی دوای دۆزینەوە جوگرافیەکان کە لەکۆتاییەکانی سەدەی پانزەهەمدا دەستی پێکرد وبووە هۆی ئەوەی کە خەڵکێکی زۆری دانیشتوانی ئەوروپا کۆچ بکەن بۆئەو وڵاتە تازە دۆزراوانە.لەبەرئەوهۆیانە ئیتر پیشەی دەستکردی ماڵەوەو کارگەبچکۆڵەکانی ناوماڵەکان بەو بەرهەمە کەمەیەوە نەیدەتوانی شمەکی دروستکراو بۆ ئەو بازاڕانە دابین بکات، بەتایبەتیش کە ئاسۆی بازرگانی نێوان ئەوروپاوجیهانی تازە کەوتە فراوانی،ئەمەش هەلێك بوو بۆ خاوەن پیشەکان ڕەخسا،ئیتر کەوتنە هەوڵی ئەوەی پشەکەیان پەرەپێ بدەن وهەوڵی ئەوەیان بوو شێواز وئامێری تازەی ئەوتۆ دابهێنن کە بەرهەمی پیشەسازی پێ زیاد بکەن، ئەوەبوو لە بەرایی سەدەی هەژدەهەمدا بۆ یەکەم جار لە بواری پیشەسازی چنین ئەوەیان داهێنا کە مەکینەکانی ئەم پیشسازییە پەرەپێبدەن وبەهێزی ئاوی خوڕ بیخەنەگەڕ، بەوجۆرە بەرهەم

زیادی کرد.لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمیشدا هێزی هەڵم دۆزرایەوەولەپیشەسازیدا بەکارهێنرا.سەرەنجام پیشەسازی پێشکەوت و گەیشتە ئەم قۆناغەی ئێستای، واتە قۆناغی کارگەی گەورە.ئیتر ئیشی دەستکرد و کارگە بچکۆڵەکان گوازرانەوە بۆ ناو بینای گەورە کەژمارەیەك کارگە لەسەر رێکسختنی دیاریکراو کاری تێدادەکەن وئامێروئامرازی گەورە و پەرەسەندووی تێدابەهێزی خەڵوزی بەردین ونەوت وشتی تر دەخەنەکار.
ئەوگۆڕانەفراوانەی لەچالاکیی پیشەسازیدا روویدا لە پێشەوە هەنگاوبەهەنگاو هاتەدی، یەکەم جاریش تەنیا بەریتانیای گرتەوە، کە داهێنانێکی زۆری لێوە گەیشتە هەرێمەکانی ئەوروپای رۆژئاوا و ویلایەتەکانی باکوری رۆژهەڵاتی وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و دواییش بۆ گەلێ دەوڵەتانی جیهان.



ئەم وێنەیە پیشەسازیی فرۆکەی تێدادیارە

## بایەخی پیشەسازی:

شانبەشانی پەرەسەندنی پیشەسازی وهەنگاونانی لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر،گۆڕانێکی بەرفراوانیش لەژیانی خەڵکی ناوچە پیشەسازییەکاندا بەتایبەتیش لەم سێ سەدەیەی دواییەدا ڕوویدا. ئەو گۆڕانە هەرتەنها نەبووە هۆی زیادبوونی داهاتی ئەوانەی کە کاری تێدادەکەن، بەڵکو بووە هۆی پەیدابوونی چەند چینێکی تازە لە کۆمەڵگەو پەیوەندی نێوان خەڵکانیشی گۆڕی،هەروەها پیشەسازی بووەهۆی پێشکەوتنی کشتوکاڵ ودەرفەتی زیاتریش بۆ کردارەکانی کشتوکاڵ ڕەخسا و ڕووبەرێکی فراوانیش بۆکشتوکاڵ وەبەرهێنرا ودەرگای ژیانی تازەی لە هەموو ڕوویەکەوە خستەسەرپشت.بەو جۆرە پیشەسازی بوو بە بناغەیەکی سەرتی گەشەسەندن وپەرەسەندنی شارستانێتی مرۆڤایەتی.




ئەمە نەخشەی ئقلیمە پیشەسازییە سەرەکییەکانی جیهانە

لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا پیشەسازی بەهۆکارێکی سەرەکی بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشگوزەرانی گەلان ونەهێشتنی بێکاران دادەنرێت، وڵاتانی ناپیشەسازی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشگوزەرانیان ناتوانن بەتەنها

پشت بەکشتوکاڵ یان بەکانزاکاری ونـاردنی کـانزا بـۆدەرەوە ببەسـتن،بەڵکو تـەنها بەپیشەسـازی ئـەم وڵاتانـە دەتـوانن بـارودۆخی ژیانیـان لەپیشـەوە بگۆڕن(تەنانەت وڵاتەکانی کەلە دەرامەتی سروشتیشـەوە هـەژارن)،نمونـەش بۆ ئەمەزۆرە،سویسـرا هەرچـەندەزۆربەی خاکەکـەی شـاخ وداخـی سـەختە و ڕووبـەری زەوی کشتوکاڵیشـی زۆرکەمەوکانزاشـی زۆردەگمەنە،کەچـی خـۆی گەیاندۆتە یەکێ لەو وڵاتانەی کە خـاوەنی بـەرزترین ئاسـتی خۆشـگوزەرانیە لەجیهاندا،هەروەها وڵاتانی ئەسکەندەنافیاش بەهۆی پیشەسازیەوەیە خۆیان گەیاندۆتە ئەو ئاستە بـەرزەی خۆشـگوزەرانی وێـڕای ئـەوەی زۆربـەی خـاك وزەویـەکانیان شـاخ وداخەودەکەونـە ئەوپـەڕی بـاکوری گـۆی زەوی کـەنزیك دەبنەوە لەبازنەی جەمسەری باکور و وەرزی گەشەسەندنی ڕووەکیشیان زۆر کورتـە.هـەروەها هۆڵەنـدا و دانیمـارك ویابـانیش لەنمونـەی ئـەو وڵاتانـەن کەپیشەسازی بۆتە هۆی بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشگوزەرانیان.

لەمـەوە پیشەسـازی لـەڕووی کۆمەڵایەتیـەوە بـەمانای پێشـکەوتن دێـت ،ولـەڕووی ئابووریـەوە بـەمانای دەوڵەمەنـدبوون وبەرزکردنـەوەی ئاسـتی خۆشـگوزەرانی دێت،ولـەڕووی ڕامیاریشـەوە مانـای سـەربەخۆیی ئـابووری وگەلان خاوەن ئیرادەی خۆیان دەبن.بەڵام بۆچـی پیشەسـازی دەبێتـە هـۆی بەرزکردنەوەی ئاستی حۆشگوزەرانی چونکە بەهای بەرهەمی کانەکانی کانزا وکێڵگـەکانی کشـتوکاڵ ودرەختـی دارسـتانەکان وسەرچـاوەکانی تـر بەرزدەکاتەوە،بۆنمونە یەك تەن لە نەوتی خاو(پترۆڵ) بەهاکەی چەندین جار بەرزدەبێتـەوە کاتێك بـەنزینی ئۆتۆمبیـل وپلاسـتیك و لاسـتیکی لێ دروسـت دەکرێت،بـەهای درەختـیش بەرزتردەبێتـەوە کاتێـك دەکرێتـە دەرگاوپەنجەرەوکاغەزوئاوریشمی دەستکرد،لەگەڵ چەندانی تر.

بــەهۆی پیشەســازیەوە داهــاتی نەتــەوەیی ولآت زیــاد دەکــات و هــەلی بەکارخستنی کرێکـار فـراوانتر دەبێـت وبێکـاری کـەم دەبێتەوە،ئەمەجگـە لـەوەی بـەهۆی پیشەسـازیەوە چـەندین کەرەستەی خـاوی سـەرەتایی بـۆ پیشەسازیەکانی تر دابین دەکرێت بەمـەش پێداویستی نـاوخۆ پردەبێتـەوە وهاوردەنی کەم دەبێتەوەوناردەنی زیاتر دەبێـت وپاشـەکەوتی دراوی بیـانی ئەم ولآتە زیاتر دەبێت کەئەمەش خزمەتێکی گـەورە بـە ئـابووری نەتـەوەیی وتوانـای دارایـی ولآتەکـە دەگەیـەنێت.ئەوانـەی لەپیشەسـازی کاردەکـەن بەشـێوەیەکی گشـتی جیـاوازن لەوانـەی لەکشـتوکالْ ولەپیشـەکانی تـردا کاردەکەن لەڕووی ئەوکاتانەی بۆیان دەمێنێتەوە پـاش کـاری رۆژانـەیان کـە دەیقۆزنـەوە بـە زیـادکردنی رۆشـنبیری وزانیـاری وچـاکترکردنی کاروباریـان وکـارکردن شانبەشـانی یـەکتر بۆهێنانـەدی داخوازیـەکانیان وبەدەستهێنانی زیـاتری کـەڵك وسوود،هەرلەبەرئەمانەشــە کــە پیشەســازی دەبێتــە هــۆی بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەلآیەتی وئابووری ورۆشنبیری بۆئەوانەی لـەوبوارە کاردەکەن هەربەمەشە کۆمەڵگە پیشەسازیەکان جیاوازن لەکۆمەڵگەکانی تر.
پیشەسـازی لێـزانینو شـارەزایی و زانیـاریو کارامـەییو تـەکنیکی دەوێـت، هەربۆیــە پیشەســازی بــەرزترین قۆنــاغی ژیــانی شارســتانیی پــڕ چــالاکی ودینامیکی دەنوێنێت،کەچاکترین هۆی توانایی زانستو تـەکنیکی بۆمیللـەت دەرەخسێنیٚو،هەر هێزو توانایەکی خۆرسكو هی ئادەمیزادیش، کـە هـەیبیٚ، بـۆی دێتــە ژێــر بــارو ســوودی لیٚ وەردەگرێت،بــەو پێیــە پیشەســازی بــە ئالۆزترینی چالاکی ئابووری دادەنرێتو، لەهەمووشیان زیـاتر زووتـر ئامـانجو ئاواتی ژیانی بەختیاریو سەربەرزی بۆ گەلان وەدەست دێنیٚ.

## بنەماكانی پیشەسازی:

ئەگەر چاوێك بەوناوچانەدا بخشێنین كە پیشەسازی لێ دامەزراوە ئەوا دەبینین چەند بارودۆخێكی دیاریكراو هەن وەك بوونی كەرەسەی خاو(سەرەتایی) وەك خاوەكانی ئاسن وتەختەبۆ پیشەسازی توانەوەی ئاسن وكاغەز،یاخود بوونی سەرچاوەكانی ووزە وەك خەڵووز و نەوت،لەهەندێ ناوچەشدا قەرەباڵغی خەڵك وپێویستی زۆریان بۆ شمەك وادەكات ئەو پیشەسازیانەی لێ دابمەزرێ كەبازاڕی هەیەوخواستی لەسەرە،بۆیە دامەزراندنی پیشەسازی لەهەرناوچەیەك پێویستی بە چەندین هۆكار هەیە كەپێیان دەوترێت بنەماكانی پیشەسازی وگرنگترینیان ئەمانەن:(كەرەسەیخاو،ووزە،بازاڕ،سەرمایە،كار،هاتوچۆوگواستنەوە...) مەرج نیە هەموو ئەوبنەمایانە فەراهەم بن بۆدامەزراندنی پیشەسازیەك ، جاری واهەیە یەك بنەما یان زیاتریە هۆكاری دامەزراندنی پیشەسازیەك دادەنرێت .

### یەكەم: كەرەسە خاوەكان

ناوچەیەك كەرەسەی خاوی تێدا هەبێت، رێگا بۆ دامەزراندنی پیشەسازی خۆشدەكات، بەتایبەتیش ئەگەر هاتوو ئەو كەرەسە خاوانە لەوانە بوون كە زوو لە كەڵك بكەونو بە گرانیش بۆ جێگای دوور بگوازرێنەوە، یان كرێی گواستنەوەیان لە گوێرەی نرخیان زۆر بە گران بوەستێت، بۆیە دەبینین ئەو جێگایانەی میوەو سەوزەو شیرو گۆشتو ماسیی زۆرە، پیشەسازی لە قوتونانی ئەو كەرەسانەی تێدا دادەمەزرێت، هەروەها ئەو جێگایانەش كە بەردی گەچ(قسڵ)ی زۆرە پیشەسازی چیمەنتۆی لێ دادەمەزرێت، ئێستا بۆمان دەردەكەوێت كە لەسەرچی

پیشەسازیی لە قوتونان لە کەربەلاو پیشەسازیی دۆشاوی تەماتە لـە دهـۆك‌و پیشەسازی چیمەنتۆ  لە حەمام ئەلعەلیل‌و لە سەماوە دامەزراون.

ئەوەی شایانی وتنیش بێت ئەوەیـە کـە پێشـکەوتن‌و پەرەسـەندنی هۆی گواسـتنەوە لـەم دوادواییـەدا، پەیوەنـدی دامەزرانـدنی پیشەسـازی بـە جێگای کەرەسە خاوەکانەوە کەمتر کردووتەوە، واتـا کەرەسـە خاوەکـان بـە ئاسـانی‌و بـە هـەرزان دەگوازرێنـەوە بـۆ جێگـای تـرو بـە گـوێرەی پێویسـت شمەکیان لەوێ لێ دروست دەکرێت، ئەوەش لە باسـی بنـەمای گواسـتنەوەدا روون دەکەینەوە.

## دووەم: ووزە (هێز)

گرنگترینی ووزە کە ئەمڕۆ پیشەسازی لەسەر بەندە خەڵووزو نـەوت‌و گازی سروشتی و تاڤگەی ئاوو هێزی گەردیلەیە (ئەتۆم).

پیشەسازی ئاسن‌و پـۆڵا کـە گـەورەترینی پیشەسـازییەکانە لـە نزیـك کانـە خەڵووزەکانەوە دامەزراوە، چ لە ئینگلتەرەو حەوزی رۆر لە ئـەلمانیاو بەشـی باکووری کانەکانی ئەپەلاش لە وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاو چ لە کانەکانی دۆنتز(دۆنتسك)ی ئۆکرانیا، هەموویان نزیك لە کانە خەڵوزەکانەوە دامەزراون.

کاتێکیش هێزو تەکانی ئاو هێنرایە ژێر بارو، کارەبای لـێ پەیـدا کـراو هێـزی کارەباکەشـی تـوانرا بـۆ دوور بگوازرێتـەوە، بۆیـە پیشەسـازی دوور لەکانەکان دامـەزرا، وەکـو پیشەسـازیی ئاسـن لـە سـوید. لـەم دوادواییەشـدا پیشەسـازی لـە جێگـەی وەهـا دامـەزرا کـە جـاران زۆر بـە دووردادەنـرا لـە سەرچاوەی سووتەمەنییەوە، بەڵام ئێستا بەهۆی پێشـکەوتنی گواسـتنەوەی نەوت‌و گازی سروشتیەوە ئەو رێگا دوورە بە دوور دانانرێت.

## سێیەم: بازاڕ

زۆربەی پیشەسازییەکان لە نزیك شارە گەورەکانەوە دادەمەزرێن کە کاروباری گواستنەوەو هۆی هاتوچۆی چاکی لێیە، چونکە دانیشتوانی زۆرو خاوەن سامانو کڕیاری پێداویستی جۆر بەجۆرو فرەی تێدا دەژین، واتا پیشەسازییەکە بازاڕەکەی لێ نزیکەو هەموو بەرووبوومێکی دروستکراوی بۆ دەنێرێو قازانجێکی زۆری دروست دەکەوێت، بێگومان بازاڕ گەرمی شمەکی دروستکراو گرنگترینی بنەماکانی دامەزراندنو بەردەوامی پیشەسازیو کرداری وەبەرهێنانە.

## چوارەم: سەرمایە

سەرمایە کۆڵەگەی دامەزراندنی پیشەسازی نوێیە،چونکە پیشەسازیی نوێ مەزنەو پارەیەکی زۆری تێدەچێت، تەنیا کەسێکیش ناتوانێت ئەو سەرمایە گەورەیە دابین بکات، لەبەرئەوە چەند کەسێك بەهاوبەشی بۆ ئامادەکردنی دەکەونە هاوکاری. لە هەندێ وڵاتانیشدا کە دانیشتوان سەرمایەیەکی ئەوتۆیان لە دەستدا نییە، دەوڵەت خۆی سەرمایە ئامادە دەکات وئەرکی پارەدانی پرۆژە گەورەکانی پیشەسازی دەخاتە ئەستۆی خۆی.

لەم دوادوایەشدا، سەرمایە لە گەلێ شوێنی ئەم جیهانەدا زۆربووەو پەیوەندیی بانكو بانککاریش لە نێوان دەوڵەتاندا فراوانتربووە،لەبەرئەوە سەرمایەی پارە بەئاسانی دەگاتە هەموو لایەکی ئەم جیهانە بەو مەرجەی قازانجی مسۆگەری تێدا بێت،بەو جۆرە دەگاتە ئەوجێگایانەی پرۆژەی پیشەسازیی تێدا دامەزرێ. بۆیە ئەگەر لەناوچەیەکدا سەرمایەی ناوخۆ نەبوو،دامەزراندنی پیشەسازی لەجێی وادا لەسەر سەرمایە پەکی ناکەوێت.

## پێنجەم: کار

پیشەسازی بە گشتی پێویستی بەکاری تەواوە،ئەو کارەش کەم بێت یان زۆر، کارامە بێت یا نیمچەکارامە، یان ناکارامەهەر جۆرێکیان بێت ببێت بە گوێرەی جۆری پیشەسازییەکە ئەو کارە پێویستە. دامەزراندنی هەندێ پیشەسازی کارگەری لێزان یان پسپۆروشارەزای ووردی تەواوی دەوێتو دەبێت بۆی ئامادە بکرێن، پیشەسازیی ئامێرو ئامرازی کارەبایی‌و ئەلکترۆنی‌وکاتژمێر لەو جۆرەن، بەڵام پیشەسازیی قاڵی(مافور)و ئاوریشم، وەکو ئەوانەی وڵاتی چین‌و ئێران کارگەرێکی زۆرو هەرزانکاری دەوێت.

لەناوچەقەرەباڵغەکاندا پیشەسازییەکی زۆر هەیە، چونکە کرێکاری هەرزانی زۆریان لێیە، سەرەڕای ئەوەش ئەو لێزانی‌و کارامەیی‌و شارەزاییەی کە لەو جۆرە ناوچانەدا هەن، بوونەتە هۆی دامەزراندنی پیشەسازیی پسپۆری.

## شەشەم: گواستنەوەو هاتوچۆ

رێگاوبان بنەمایەکی گەورەی دامەزراندنی پیشەسازییە، لەبەر ئەوە گەلێ جار پیشەسازی لە جێگایەکی وەهادا دادەمەزێت کە رێگاوبان‌و گواستنەوەی تێدا زۆر بێت‌و هەرزانیش بێت‌و لە هەموو لایەکیشەوە رێگاوبانی بێتەوەسەرو تێچوونی زیادەی تر نەچێتەوە سەر گواستنەوەی کەرەسەی خاوو شمەکە دروستکراوەکان، وڵاتەکانی رۆژئاوای ئەوروپاش باشترین نموونەی ئەم جۆرە پیشەسازییەن لە جیهاندا، چونکە رێگاوبان‌و هۆی جۆربەجۆری گواستنەوەیان زۆرە.

هەروەهاش دەریاچە گەورەکانی ئەمریکای باکوور گەلێ پیشەسازییان لە نزیکەوە دامەزراوە چونکە رێگای ئاوییی هەرزان روو لە هەموو لایەکی ئامادەیە.

جا دوای ئەوەی بنەمەکانی دامەزراندنی پیشەسازیمان خوێند، ئێستا لە یەکێك لە پیشەسازییە گەورەکان دەکۆڵینەوە، تا بزانین ئەو بنەمایانەی باسمان کردن چ کارێکیان لە دامەزراندنیدا هەیە، واتا دەمانەوێت بزانین چۆن چۆنی ئەو بنەمایانە لەگەڵ دامەزراندنی ئەم پیشەسازییەدا گونجاون، ئەو پیشەسازییە گەورەیەش کە ئێستا لێی دەکۆڵینەوە، پیشەسازیی پاڵاوتنی نەوتە.

## پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت

پاڵاوتنی نەوت پیشەسازییەکە بە نەوتو لێ دەرهێنراوەکانی نەوتەوە بەندە،هەندێ جاریش پێی دەڵێن پوختەکردنی نەوت،نەوت شلەیەکە گەلێ جۆرە هایدرۆکاربۆناتی تێدایە کەلە رێژەی هایدرۆکاربۆناتی خەڵوز زیاترە،جگە لەوەش خڵتەو لیتەیەکی تێکەڵی خۆیواوك وقورولمو گۆگردو شتی تری تێدایە.

نەوت تێکەڵاوێکەو لە چەند پێکهێنەرێکی جیا جیا پێکهاتووە، پێکهاتنی هەندێکیان ئاسانەو هی هەندێکی تریان ئاڵۆزە، لەبەر ئەوە نەوت لێ دەرهاتی جۆر بەجۆری لێ پەیدا دەبێتو هەندێکیان لە هەندێکیان بە هۆی کردارێك لە کردارەکانی دڵۆپاندنەوە جیا دەکرێنەوەو شلە جۆربەجۆرەکانی کە پلەی کوڵانیان جیاوازە، بەهۆی دڵۆپاندن دەکرێن بە گازو ئەمانیش بە ساردکردنەوە دووبارە خەست دەکرێنەوەو شلەی جۆربەجۆریان بە جیاجیا لێ پەیدا دەبێت، بەنزینی فرۆکەو هی ئۆتومبێلو نەوتی سپیونەوتی

دیزل‌ونەوتی رەش بەوجۆرە پەیدا دەبن،گەڵێ جۆری رۆن‌و گریس هەر بەو جۆرە لە نەوتی خاو جیا دەکرێنەوە،جگە لەوانەش پاشماوەی قورس‌و هەندێ جۆرە گازیش لەو کردارانە بەجێ دەمێنێ، هەندێك لەو لێ دەرهاتانە هۆی جۆربەجۆری گواستنەوەو هاتوچۆیان پێ دەخرێنەکارو لە ئێستگەکانی پەیداکردنی هێزی کارەباشدا بەکاردەبرێن‌و، هەندێکی تریان دەبن بە کەرەسەی خاوی پیشەسازیی پترۆکیمیاوی، کە سەدەها ماددەی پلاستیك‌و لاستیك‌و ریشاڵ‌و داوی وەکو هی لۆکەو خوری‌و ئاوریشم‌و گەڵێ ماددەی توێنەرەوەو نەفتالین‌و جۆرەها بۆنی خۆش‌و بۆیاخ‌و داوودەرمان‌و ماددەی ئارایشت‌و رازاندنەوەیان لێ دروست دەکرێن، قیریش لە دوای هەموویانەوە دروست دەکرێت.

پیشەسازی پاڵاوتنی نەوت کاتی خۆی هەر لە نزیك کانەکانەوە دادەمەزرا،بەڵام ئێستا پێشکەوتنی هۆیەکانی گواستنەوەوبەتایبەتیش کەشتی گواستنەوەی نەوت‌و راکێشانی لوولەی نەوت بۆماوەی دوور، وای کردووە کە ئەم پیشەسازییە لەجێگای زۆر دووریش لە کانەکانەوە دابمەزرێت، بەتایبەتیش لە هەندێ بەندەردا کە بە ئاسانی‌و بە هەرزان نەوتی خاوی دەگاتێ‌و، لە رێی دەریاشەوە بەروبوومی دروستکراوی خۆی بۆ دەرەوە دەنێرێت،وەکو کارگەکانی پاڵاوتنی نەوت کە نزیك بە شاری عەدەن دامەزراون، کەچی وڵاتی یەمەنی باشوور بیرە نەوتیشی هەر تێدانییە،بەڵام جێگای بەندەرەکەی عەدەن کەبۆتە رێرەوی نەوتبەرە گەورەکانی نێوان کەنداوی عەرەب‌ودەریای سوورو لەوێشەوە بۆ نۆکەندی سوێس‌و بەرەو ئەورووپا. کارگەی پاڵاوتنی نەوت لەو بەندەرانەشدا دادەمزرێت کە لوولەی نەوتیان دەگاتێ‌و تیایاندا کۆتاییان دێت،وەکو ئەوەی شاری (تەرابلوس)ی کەناراوەکەی لوبنان، کە هێڵی لوولە نەوتەکانی عێراقی، روولە دەریای

ناوەڕاستیان تێدادەوەستێ، هەروەهاش ئەوەی (زەهرانی) باشووری بەیروت، کە هێڵی لوولە نەوتەکانی (تابلاین) ی سعودیەیان تێدا دوایی دێت.

بازاڕی جەنجاڵیش بۆ ساغکردنەوەی نەوت دیسان لە دامەزراندنی پیشەسازیی پاڵاوتنی نەوتدا کاری خۆی هەیەو،ئێستا گەورەترینی کارگەی ئەو پیشەسازییە لەنزیك بازارەکانی ساغکردنەوەی لێ دەرهێنراوەکانی نەوتەوە دادەمەزرێت،چ ئەوانەیان کە هۆی گواستنەوەو هاتوچۆیان پێ دەخرێنەگەڕ، هێزی کارەبایان لێ پەیدا دەبێتو چ ئەوانەیان کە دەبن بە کەرەسەی خاوی پیشەسازیی پترۆکیمیاوی ،هەر لەبەر ئەو بازاڕ گەرمیەشە کە پیشەسازیی گەورەی پاڵاوتنی نەوت لە نزیك شارەکانی ئەمستردامو ناوچەی لەندەنو شارەکانی یاباندا دامەزراون.

ئەم پیشەسازییە ئەمڕۆ کە بەو مەزنییە پێشکەوتووەو کیمیاو ئەندازەی تێدا دەخرێنەکار، بێگومان سەرمایەی گەورەی تێدا وەبەردەهێنرێت، لەبەرئەوە لە وڵاتانی دەوڵەمەندی وەکو یابانو رۆژئاوای ئەوروپادا زیاتر دادەمەزرێت.هەرچەندە پالاوگە نوێیەکانی نەوت رووبەرێکی فراوانیان پێویستە کەچەندین کیلۆمەتری چوارگۆشە دەگرێتەوە بۆدامەزراندنی قوللەی بەرزوعەماری خڕی لە کانزا دروستکراوی گەورەو فرنی داگیرساوی زۆرو لوولە نەوتێکی ئالۆزو بەیەکداچووی چڕ کە نەوتی پێدادەڕوات بۆ دڵۆپاندن،بەروبوومی دروستکراویشی پێدا دەگوازرێتەوە،سەرەڕای ئەو گەورەییو پەرەسەندنەی ئەم پیشەسازییە،کەچی هێشتا لەگوێرەی پیشەسازیی گەورەی تری وەکو هی ئۆتومبێلودروستکردنی کەشتی، کارگەری کەمترە، چونکە زۆرتر پێویستیی بە لێزانیو توانای تەواوی ئەندازیاری هەیە نەك بە زۆریی کارگەران.

## پاشەرۆژی(دوارۆژی) نەوت:

نەوت خەلاتێکی سروشتیەو ملیۆنەها ساڵە لەناو زەویدا هەیە، تا مرۆڤ پەی پێ بردو دەری هێناو لێی سوودمەندبوو، بەلام ئەم خەلاتە سروشتیە چەندە هەر ئەوەندەیەو زۆرتر نابێتو کە نەشما ئیتر نابێتەوە.

جیهانیش بە گشتی ئەوە دەزانێت، لەبەر ئەوە هەموو تینو توانایەکی هونەرکارو پارەیەکی زۆرو زەبەند تەرخان کراوە بۆ دۆزینەوەو بەکارهێنانی سەرچاوەی تری هێزو سووتەمەنیو لەم رووەوە چەند پێشنیارێکیان کردووە کە کێشەی تەواوبوونی نەوت چارەسەر بکەنو بۆ ئەو مەبەستە بیریان لەمانەی خوارەوە کردەوە:

١. نەوت لە خەڵووزی بەردین دەربهێنن.
٢. نەوت لەبەردی (الطفل الزيتي) (Scale Oil) دەربهێنن.
٣. ووزەی خۆر بخەنەکار.
٤. گەرمیی هەناوی زەمین بخەنەکار.
٥. ووزەی گەرمیوشەپۆلەکانی هەلکشانوداکشانی دەریاوزەریاکان بخەنەکار.
٦. هێزی (با) بخەنەکار.
٧. ووزەی گەردیلە (ئەتۆم) بۆبەدەستهێنانی کارەبا زیاتر بخەنەکار.
٨. دەرهێنانی ئەلکحولو ماددەی تر کە بۆ سووتەمەنی بشێت لە رووەکو شتی تر .

## ووزەی خۆر:

تینی ووزەی خۆر لەوانەیە رۆلێکی سەرەکی ببینێت لە بواری ووزە، چونکە هێزێکی پاکەو تەواویش نابێت، بەلام ئەوەندە هەیە ئێستا بەگران دەوەستێتو زۆری تێ دەچێت، شارەزاو پسپۆرانیش وا بە تەمان لەچەند سالێکدا بتوانن کارێکی وەها بکەن کە کەمتری تێ بچێتو بتوانێت شان لەشانی سەرچاوەکانی تری ووزە بدات.



وێنەی بەکارخستنی ووزەی خۆر

به چەند شێوەیەکیش ووزەی خۆر دێتە دەستو بەکاردەبرێت، لەوانەش:

١- لوولەکێشی بە رێگەیەکی دیاری کراوو هێلکارییەکی تایبەتی بەسەر سەربانەکانەوە دادەمەزرێتو ئاوی ناویان گەرم دەکرێت ئەو ئاوە داخە ناو ماڵەکانی پێ گەرم دەکرێتەوەو بۆ ئیشی تریش سوودی لێ وەردەگیرێت.

٢-ئاوێنەیەکی زۆری شێوە زەرەبین بەجۆرێك رێکدەخرێن کە تیشکی خۆر خڕ بکەنەوەو بیدەن لە چەند عەماراوێك، بەو جۆرە ئاوەکەی ناویان دێتە کوڵو بەهێزی هەڵمەکەی دەزگای پەیداکردنی کارەبای پێ دەخرێتە گەڕ.

٣-شانەی وزەی خۆر: ئەم شانانە لە چەند تیلماسكێك(شرائح) پێكدێن كە لەماددەی سلیكۆنی پاك دروستكراون، ئەم شانانە هەر تیشكێكی خۆریان بكەوێتە سەر یەكسەر دەیكەن بە ووزەی كارەبا، هەر ئامێرو دەزگایەكیش كە لەناو مانگە دەستكردەكاندا بۆ پێوانەكردنو ناردنی زانیاری دانراون هەموویان بەم جۆرە شانانە كاردەكەن.

لەم دواییانەش لە یابان و ولاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا لەسەربانی هەندێ خانووەكان ئەم جۆرە شانانە دانراون بەرامبەر بە خۆر بۆ وەدەستهێنانی ووزەی كارەبای پێویست بۆ ئەم خانوانە،شارەزایان پێیان وایە كەلە داهاتویەكی نزیكدا ئەم جۆر خانووانە ئامادە دەكەن بۆ كاروباری بازرگانی،هەرخانوویەكیش پیل(پاتری)ێكی بۆ دابین دەكرێ بۆ خەزن كردنی ئەوكارەبایە لەرۆژانی هەتاو و خەزن كردنی كارەبا لەهێزی با.





دوو وێنەن، هێلكاریی بەكارخستنی ووزەی خۆر دەنوێنن

### گەرمیی هەناوی زەمین:

لەناو هەناوی زەمینەوە کانیاوو فوارەی گەرم هەڵدەقوولێتو هـەڵمی ئاوی کوڵاویش لە هەندێ جێگەوە لەژێر پەستانێکی زۆر گرانـەوە بـە پـڕ تـاو دەردەپەڕێتـە دەرەوە، سـەرەڕای ئەوانـەش مـاددەی تـواوەی نـاو کانییـە ئاگرینەکانیش لەکاتی تەقینەوەدا دەردەپەڕن. هەتا ئێستا، توانراوە کە ئـەو ئـاوە گەرمانـە بـۆ گەرمکردنـەوەی مـاڵان بخرێنـە کـارو، لـە دوورگـەی (ئایسلەندە)شدا کە ئەوپەڕی باکووری زەریای ئەتڵەسـی کـەوتووە، تـوانراوە کە ئاوی داخی کانیـاوە گەرمـەکانی بۆ گەرمکردنـەوەی مـاڵان بخرێتـە کـار، هـەروەها هێـزی هـەڵمی دەرپـەڕیوی بـن زەوییـەکانی دۆڵـی ئیمپریـال (Imperial Valley) کـە رۆژئـاوای وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا کـەوتووە، بـە تـەواوی‌و بـە کـرداریش بـۆ پەیـداکردنی ووزەی کارەبـا خراوەتەکار.

ئومێدیش وایە لوولەئاو بە هەناوی زەویدا بەقوڵایی شۆڕ بکرێتـەوەو بگاتـە تاوێرە گەرمەکانی ناو هەناوی زەمین‌و ئەو هێزی هەڵمەی کە پەیدا دەبێت‌و لـەم لوولانـەوە دەردەپـەڕێت بۆ پەیداکردنی ووزەی کارەبا کـەڵکی ببێت‌و سوودی لێ وەبگیرێت.

## بەشی حەوتەم

## جوگرافیای بازرگانیو گواستنەوە

### پێناسینی بازرگانیو گواستنەوە

### بازرگانیو گواستنەوە:

بازرگانی بریتیە لەکرداری کڕین و فرۆشتنی شمەك وخزمەتگوزاری لەناوەخۆ یان لەنێوان ولآتاندا،بەلآم گواستنەوە مەبەست لێی گواستنەوەی شمەك و خەڵکە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.بازرگانی بە پیشەیەك دادەنرێت کەپەیوەندی بە وەبەرهێنانو سوود لێ وەرگرتنی دەرامەتی سامانەوە هەیە کەمرۆڤ دەتوانێت لە ژینگەو هەلومەرجی جوگرافیای جیاوازدا ئەنجامی بدات.سوود لێ وەرگرتنو هەمەجۆرەیی ئەو دەرامەتەش پەیوەندیی بەپلەی شارستانێتیو ژیان گوزەرانو زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانەوە هەیە.جا لەبەر جیاوازیی ژینگەو هەلومەرجی جوگرافیو هەمەجۆرەیی دەرامەتو پێشکەوتنی چالاکی مرۆڤ لە وەبەرهێنانی دەرامەتدا،ئیتر زۆرتر پێویستیان بە ئاڵوگۆڕی شمەك بوو لەنێوان ئەو هەرێمانەدا کە خەلەو شمەکی جیاوازیان هەیە.بەو جۆرە ئاڵوگۆڕی بازرگانی هاتە کایەوەو(شمەك بەشمەك) بووە رژێمی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لە نێوان کۆمەڵەمرۆڤە سەرەتاییەکان،بەلآم ئەم رژێمی ئاڵوگۆڕیە لەنێوان ئەو کۆمەڵآنەدا بەیەك شێواز نەبووەو، شمەك بۆ ئاڵوگۆڕ تا ئەوەندە گوازراوەتەوە کەبە پیادە دەتوانن بیگەنێ ،بە زۆربوونی دانیشتوان و پەرەسەندنی پێداویستو هەوڵدانی پەیداکردنی خۆراکیش، مرۆڤ کەوتە کۆششی ئەوەی هۆیەك بدۆزێتەوە کە لە جێگەکەوە پێی بچێت بۆ جێگایەکی تری دوورتر لەوەی کە

پێشتر دەیگەیشتێ.هات کەڵەکی دروستکردو لەنێوان کۆمەڵگاکانی نیشتەجێی کەنار رووبارەکاندا بەکاریانهێنا.

بە پێشکەوتنی کۆمەڵی ئادەمیزاد، رژێمی ئاڵوگۆڕیش پەرەی سەند، ئەوەبوو رێگاوبانی هاتوچۆ ئاسانتر کراو هۆی تازەتری گواستنەوەش پەیدابوو وشمەکی جۆربەجۆریش کە بۆ ئاڵوگۆڕ بشێتو کەوتبێتە ژێر سایەی رژێمی ئاڵوگۆڕەوە ئەوەندە زیادی کرد کە گرنگییەکی تەواویدا بە کرداری گواستنەوەیان، بە تایبەتیش کە مرۆڤ دەرامەتی سروشتی بەشێوەیەکی ئەوتۆ هێنایە ژێر بار کە بەروبوومی کشتوکاڵو هی پیشەسازیش تەواوی کەوتە فراوانیو لە پێویستی خۆی بە زیادی مایەوە، لەبەر ئەوە دەستی کرد بە گواستنەوەی ئەو بەرووبوومە زیادەیە بۆ ناو ئەو کۆمەڵگا مرۆییانەی کە لەو جۆرە بەرووبوومەیان بۆ نایەتە دەست، لەوێ بە شمەكو خۆراكی ئەوتۆی دەگۆڕییەوە کە لەناوچەکەی خۆیدا نەدەتوانرا نە بهێنرێتە بەرو نە دروست بکرێت. بەو جۆرە پیشەی بازرگانی لەنگەری هەردوو تای خستنەڕوو وخواستی شمەکی جۆراوجۆر لە هەرێمە جۆربەجۆرەکانی جیهاندا رادەگرێت.

### بنەماکانی پەیدابوونی بازرگانی:

سروشتی وەبەرهێنانو بەکاربردن بەپێی خواستو ویستی خەڵك بۆ بەکاربردن و زیادە بەرهەم لە هەرێمە جیاوازەکانی جیهاندا دەگۆڕێت، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەندێ هەرێمی جیهان بە پێویستی بزانێت زیادە بەرهەمی خۆی ساغ بکاتەوەو بۆ دەرەوەی بنێرێت، هەندێ هەرێمی تریش کە ئەو بەرهەمەی نییە ، یان زۆری پێویستەو کەمی لێی هەیە، ناچاربێت لە دەرەوەی بکرێتو بیهێنێت، جا لەئەنجامی ئەم دابەشبوونە

نایەکسانەی شمەك وبەرهەمەکان لە نێوان هەرێمەکان کردارەکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی دێتەئاراوە، بۆیە پێویستە هۆکارەکانی پەیدابوونی بازرگانی لەم خاڵانەی خوارەوەدا دەستنیشان بکەین:

١. ناچونیەکی دەرامەتی سروشتی.
٢. ناچونیەکی چڕی دانیشتوان.
٣. ناچونیەکی ئاستی داهات و گوزەرانی دانیشتوان.
٤. پلەی پەرەسەندنو پێشکەوتنی ئابووری.
٥. ئاسانیی هاتوچۆ (گواستنەوە).

### ١. ناچونیەکی دەرامەتی سروشتی:

بە واتای جوگرافیایی کە دەڵێین ژینگەی سروشتی مەبەستمان زەوییە، کە بنەمایەکی گرنگە لە بنەماکانی بەرهەمهێنان. خستنەژێربارو وەبەرهێنانی ئەو ژینگەو دەوروبەرە سروشتیەش، بەو دەرامەتەشەوە کە تێیدا هەیە، بە بەکارهێنانی بنەماکانی تری بەرهەمهێنانەوە دێتە دی، کە کارو سەرمایەن. زەوی هەموو وشکانی دەگرێتەوە کە بەرگی غازیی دەوری داوە، هەروەها ئاوەکانیش دەگرێتەوە کەبریتین لە دەریاو زەریاکان ،وسەرچاوەیەکن بۆ سامانی ماسی و هۆکارێکن بۆ هاتوچۆی مرۆڤ و گواستنەوەی شمەکە بازرگانیەکان بەهۆی هێڵەکانی دەریاوانی، لەبەر ئەوە بە هۆکارێکی بەستنەوەی نێوان ئاوەدانییەکانی دادەنرێت.

بەڵام سەر وشکانی ئەوە جێگەو نشینگەی مرۆڤەو، خۆیو ئاژەڵو پەلەوەری بەسەریەوە دەژینو، دامودەزگای پیشەسازیی لێ دامەزراندووەو،گەلێ ناوچەی کشتوکاڵولەوەڕگاشی لێ هێناوەتەدیو،

بەسەرچاوەی کانزاکانیش دادەنرێت. بێگومان ئەو زەویەش کە مرۆڤ داگیری کردووە تا فراوانتر بێت کان و کانزای زیاتر دەبێت، هەموو رووبەری وشکانیش نزیکەی ٣٧بلیۆن فەددانە، کە ٤ بلیۆنی کەوتۆتە هەرێمە جەمسەریەکانەوە، ئەو رووبەرەش کەماوەتەوە چواریەکی گژوگیا دایدەپۆشێت و لە(٤٠٪)یشی دارستانە و چیش مایەوە ئەوە زەویی کشتوکاڵە یان بۆ کشتوکاڵ دەست دەدات. هێزو پێزوبرشتی ئەم زەوییە کشتوکاڵیەش لە هەموو لایەکیدا وەکو یەك نییەو،بە گوێرەی هەوڵ و کۆشش و شێوازی کشتوکاڵ وئەو هۆکارانەش کە کار لە وەبەرهێنانی دەکەن، جیاوازییان هەیە،بۆنموونە ئاووهەوا کار لە جۆری کشتوکاڵ و لەوەرگاکان و پێکهاتنی گڵ(خاك) یش دەکات چونکە ئەوناوچانەی کە بارانیان تەواو لێ دەبارێت ودەرامەتی ئاویان زۆرە کشتوکاڵی دێمی لێ دەکرێ ،ئەوانەش بارانیان نییە یان زۆر کەمە، تەنیا هەندێ جێگای لێ دەرچێ کە کانی یان بیر یان رووباری هەیە، دەنا پاکی بۆتە بیابان.   لەبەرئەوە دەرامەتی سروشتی بەشێوەیەکی یەکسان لەهەموو هەرێمەکاندا نییەچونکە هەموو هەرێمەکان وەکو یەك زەویی چاکیان بەرنەکەوتووەو، جیاوازیی دیاردەیەکی رووی زەویش لە جێگایەکەوە تا جێگایەکی تر چەندێتی و چۆنێتی بەرهەمەکە دەگۆرێت.

سامانی کانزاش وەنەبێ لە هەموو هەرێم و ناوچەیەکدا هەبێت،جێگەی وا هەیە زۆری لێیە، ناوچەی واش هەیە کەمی هەیەو، هەشە هەر نییەتی، بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی جۆراوجۆریی لەچالاکی ئابووری ولەئاستی ئابووری وکۆمەلایەتی ناوچەکان، بۆیەناچونیەکی لەدەرامەتی سروشتی هەرێمەکان دەبێتە هۆی پەیدابوونی بازرگانی.

### ٢. ناچونیەکی چڕی دانیشتوان:

ئادەمیزاد بەهۆکارێك دادەنرێت کە گرنگی خۆی هەیە لە کردارەکانی بەرهەمهێنان و بەکاربردن کەبەهۆی ئەوتواناو شارەزاییەی توانی سوود لە دەرامەتی ژینگەی سروشتی وەربگرێ وبیخاتەکار.لەبەرئەوە ژمارەی دانیشتوان وئاستی گوزەران و کۆمەڵایەتی باش و هێزو توانای شت کرینیان کاریگەرن بۆ چەندێتی وسروشتی بەکاربردن.ئەوناوچانەی کە چڕی دانیشتوانیان زۆرە وئاستی گوزەرانیان بەرزە و خاوەن دەرامەتی سروشتی هەمەچەشنن،ئەو دەرامەتە وەبەردەهێنن بۆ بەرهەمهێنانی بنەمای پێویستو ناپێویستی (الکمالیة) ژیانی خۆیان، لەوانەشە ئەو دەرامەتە بەشی هەموو پێویستییەکی ئەو جۆرە هەرێمانە نەکات. دەوڵەتی واش هەیە ئاستێکی گوزەرانی بەرزودەرامەتێکی سروشتی زەبەندی هەیە، ناوچەی واش هەن کەچڕی دانیشتوانیان کەمە کەچی شمەکی زیاد لە پێویستی خۆیان دێننەبەر،وەکو کەنەداوئوستڕالیاونیوزیلەندە ئەم جۆرە وڵاتانە دەتوانن ئەو بەروبوومەی کە لەدانیشتوانی خۆیان زیادەیە بینێرن بۆئەو وڵاتانەی کە چڕی دانیشتوانیان زۆرە و لەو بەروبوومەیان نییە،یان ئەوەندەیان نییە کەبەشی هەموودانیشتوانیان بکات،بەوجۆرە ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەنێوان ئەو دەوڵەتەودەوڵەتانی تردا دێتەدی.

### ٣. ناچونیەکی ئاستی داهات و گوزەرانی دانیشتوان:

ئەگەر ئاستی گوزەرانو داهاتی دانیشتوان چونیەك نەبێت، بێگومان خواستیان بۆ بەکاربردنی شمەکی پێویستو ناپێویست وەك یەك نابێت، چونکە ئەوانەی گوزەرانێکی بەرزیان هەیە ماددەو شمەکی گرانبەهای ئەوتۆ دەکڕن کە لەوانەیە لەوەو پێش چاویشیان پێی نەکەوتبێ،ئەمە لەسەر

ولاتەتازەپێگەیشتوەکانی بەرهەمهێنی نەوت جێبەجێ دەبێت کەپارەیەکی زۆرخەرج دەکەن بۆهێنانی هەندێ شمەکی گرانبەهای وەك ئۆتۆمبیل وئامێری کارەبایی بەمەش قەبارەی بازرگانیی نێوان دەولەتان گەورەتر دەبێت. بەرزبونەوەی ئاستی گوزەران بە داهاتی نەتەوەییەوە بەندە، چونکەهەتا داهاتی نەتەوەیی بەرزتر بێت کە بریتیە لە کۆی داهاتی کشتوکاڵو بازرگانیو پیشەسازی، داهاتی تاکەکەسیش بەرزتردەبێتو بەشی زیاتری لێ بەردەکەوێت، واتا توانای کڕینی زیاتر دەبێت.

## ٤. پلەی پەرەسەندنو پێشکەوتنی ئابووری:

ئاستی ئابووری هەر هەرێمێك بە دیاردەکانی چالاکییە گشتیەکانی ئەو هەرێمەوە بەندەو، لەسەر پلەی پێشکەوتوویی خەڵکەکەی وەستاوە. ئەوشێوازە زانستیانەی کە مرۆڤ لە وەبەرهێنانی دەرامەتی سروشتیدا دەیخاتە کار، دەتوانێت هەم گیروگرفتی ڕێگای وەبەرهێنان نەهێڵێت و هەم جۆری بەروبوومیش چاکتر بکات. مرۆڤ لە کانزاکردنو پیشەسازیو کشتوکاڵو لەوەرگای ڕێکوپێکی بازرگانیشدا شێوازی زانستیانەی خستۆتەکارو لەناوچە وشکەکاندا کاریگەری وشکەساڵی و بێ بارانیی کەمتر کردۆتەوەو لە ناوچە وشكو نیمچەوشكو ناوچەکانی وەرزەبارانەدا بەنداوی دروستکردووەو جۆگای زۆری لێ هەڵبەستووەو رووبەرێکی زۆری شین سەوزکردووە. هەروەها لە ڕێی موتوربەکردنەوە جۆرەها تۆوی چاککراوی هێناوەتە دەستو بە پەیین کردنی زەویش هێزو پێزی زیاتر کردووە. جگە لەوانە بەهۆی دروستکردنی ئامێرو ئامرازی جۆر بەجۆریشەوە توانای کارگەرانیش لە دروستکردنو زۆرکردنی بەروبوومو شمەکدا زیادی کردووە. بەمانەش بێگومان داهاتی مرۆڤ زیادبووەو هێزی کڕینی بۆشمەکی خواردنی گرانبەها وبۆ کەمالیات لەشمەکی پیشەسازی پتر بووە، بەم جۆرە بازاڕ گەرم

دەبێتو پڕ دەبێت لە شمەكی دروستكراوی ناوخۆو هێنراوی دەرەوەش كەلەئەنجامی زیادەی شمەك دێتە ئاراوە. بەو جۆرە ئاڵوگۆڕی بازرگانی روو لە فراوانبوون دەكات.

### ٥. ئاسانیی هاتوچۆ (گواستنەوە):

ئەو هەرێمانەی توانای زۆری بەرهەمهێنانیان هەیە، شمەكی زیاد لە پێویستی خۆیان دەبێت، ئەم زیادەیەش دەبێت بگوازرێتەوە بۆ ئەو هەرێمانەی كە لەو جۆرە شمەكەیان كەمەو لەوێ ساغ بكرێتەوە. جا لەنێوانیاندا رێگاوبانی تەواو بۆ گواستنەوەی ئەو شمەكانە دەكرێتەوەو، هۆی گوێزەرەوەی بارو بارخانەی بۆ ئامادە دەكرێت، كە ناوچەكانی بەرهەمهێنانو ناوچەكانی بەكاربردنو كاركردنی شمەك بە یەكەوە دەبەستێتو، بازنەی چالاكی ئابووری پێ فراوانتر دەبێت. زۆریو چڕی رێگاوبانو گواستنەوەش لەنێوان هەرێمەكاندا بە گوێرەی پلەو هێزی چالاكی ئابووریوئاستی شارستانێتیو گوزەرانی دانیشتوان لە هەرێمێكەوە تا هەرێمێكی تر جیاوازە، لەبەرئەوە لە چەند هەرێمێكدا پێویستیان بە هاوردنو بەكاربردنی شمەك بە تینتر دەبێت، بەمەش ئاڵوگۆڕی بازرگانی پەیدا دەبێتو دێتە گۆڕێو گواستنەوەیەكی چڕو پڕیش دێتەدی .بەڵام لە هەرێمە هەژارەكاندا چالاكی گواستنەوە لە چاو هی هەرێمە دەوڵەمەندەكاندا شتێكی ئەوتۆ نییە.

هەروەها پرۆژەكانی گەشە پێكردنی ئابووریش ئەگەر رێگاوبانی هاتوچۆی تەواویان بۆ رابكێشرێت، بێگومان ئەوا رۆڵێكی گرنگ وسەرەكی دەگێڕن لە كردارەكانی سەركەوتنی ئەو پرۆژانە.

## ڕێگاکانی گواستنەوەو (خاسیەتەکانی)و هۆو ئامرازی گواستنەوە:

چاکی ڕێگاوبانو جۆری ڕێگاوبان کار لە بەروبوومی ئەو دەوڵەتانە دەکات کە چالاکی ئابووریی پێشکەوتوویان هەیە، لەبەر ئەوە ئەم جۆرە دەوڵەتانە باشترین ڕێگاوبانی ئەوتۆیان هەیە کە بە خێرایی هۆی گواستنەوەیان پێدا دەڕواتو بەمەش ئەم ڕێگاوبانانە خزمەتێکی بنەڕەتی پێشکەش دەکەن لە ناردن و فرۆشتنی بەروبوومی دەوڵەتەکە لەناوخۆ ودەرەوە.

ڕێگاکان بۆ ئەم جۆرانەی خوارەوە پۆلێن دەکرێن:

١. ڕێگا وشکانییەکان.

٢. ڕێگا ئاوییەکان.

٣. ڕێگا ئاسمانییەکان.

### ١. ڕێگا وشکانییەکان:

ڕێگا وشکانییەکان بەگوێرەی جۆری هۆیەکانی گواستنەوە جۆراوجۆرنو ئەمانەن:

أ-ڕێگای ئاسن.

ب-ڕێگای ئوتۆمبێل.

ج-ڕێگای لوولەکێشی(بۆڕی).

#### أ- ڕێگای ئاسن:

مەبەست لە ڕێگای ئاسن هۆیەکی گواستنەوەیە کە(شەمەندەفەر)ی پێ دەڵێنو بریتیە لە چەند فارگۆنێك کە مەکینەیەك بە دووی خۆیدا بەسەر دوو هێڵی ئاسنی هاوتەریبدا رایان دەکێشێ، ئەم مەکینەیەش بە هێزی هەڵم یان بە کارەبا دەکەوێتە گەڕ، ماوەی نێوان ئەو دوو هێڵە ئاسنەش ئەوەندەی

ماوەی نێوان دوو چەرخەی بەرامبەر یەکی فارگۆنەکانە وبەو ماوەیەش دەوترێت پێوەر، پێوەریش جۆراو جۆرن‌و هەر یەکەشیان ناوی خۆی هەیە. (پێوەری ئاسایی) ئەوەیانە کە لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا باوەو ماوەکەی لە (١,٠٦) مەتر تا (١,٤٥٣) مەتر دەبێت، (پێوەری تەنگ)یش هەیە کە ماوەکەی لە (٠,٦٠٠) مەتر تا کەمتر لە (١,٠٦٧) مەتر دەبێت‌و شەمەندەفەر سووك‌و لەسەرخۆ بەسەریدا دەڕوات. لە عێراقدا لە هەردوو جۆرە پێوەرەکە هەیە. ئەم وێکنەچوون‌و جۆراو جۆری هێڵەش لەناو دەوڵەتاندا دەبێتە هۆی دواخستنی گواستنەوەو پاشکەوتنی ئاڵوگۆڕیش، واتا شمەك زۆرتری تێ دەچێت،گەلێ دەوڵەتیش بۆ ئەوەی کرداری جموجۆڵی هاتوچۆ بە هەردوو باری چوون وهاتن ئاسان بکەن، هاتوون لە هێڵێك زیاتریان راکێشاوە.

ساڵی ١٨١٤بە ساڵی پەیدابوونی یەکەم شەمەندەفەری هەڵمی دادەنرێت کە لە سەعاتێکدا (٤) میلی بڕی. یەکەم هێڵی ئاسنی شەمەندەفەریش لە ساڵی ١٨٢٥دا لەنێوان شاری ستۆکتن‌و شاری دارلنگتۆن لە بەریتانیا دامەزرا کە (٤٠کم) درێژ بوو. راکێشان‌و بڵاوبوونەوەی هێڵی ئاسنیش بەو زۆرییە لەبەر ئەوەیە کە گواستنەوەی شمەك بە شەمەندەفەر ئاسانترەو کرێی کەمتری تێ دەچێت وەك لەهۆی تری گواستنەوە.هەر بە نموونە، گواستنەوە بەهۆی ئوتۆمبیلەوە پێنج ئەوەندەی کرێی شەمەندەفەری تێ دەچێت‌وبەهۆی ئاسمانیشەوە(١٩٠) ئەوەندەی شەمەندەفەری تێ دەچێت. جگە لەوەش شەمەندەفەر ئەوەی باشە کە باری هەوا (جەو) کەمتر کاری تێ دەکات تا ئوتۆمبێل‌و فڕۆکە. لەگەڵ ئەوەشدا، گواستنەوە بەهۆی شەمەندەفەر، بێ کەم‌وکوڕی‌و بێ گیروگرفت نییە،چونکە بارداگرتن‌و بارکردنەوەی زۆر دێتە ڕێ، کە ئەمەش بەشێك لەو بارانەی پێ لە کەڵك دەکەوێت‌و سەرەنجام

دەبێتە هۆی کە ئەو شمەکە بە زۆرتر بووەستێتو کرێی گواستنەوەکەشی زیاتری تێ بچێت. شمەکی واش هەیە شکستەنییەو (قابلة للكسر) لەو داگرەو بارکە زۆرەدا کەمو زۆر لێی دەشکێ، سەرەڕای ئەوانەش شەمەندەفەری بارهەلگر لەسەرخۆیەو خێرا نییە. جا بۆ چارەسەرکردنی ئەو هەموو گیروگرفتەی شەمەندەفەر بۆ ئەوەی بتوانێت شان لە شانی هۆی تری گواستنەوە بداتو، لە ڕووی چالاکی هۆی تری تیژڕەودا دانەبڕێت، بەڕێوەبەرانی هێڵی ئاسن لە جیهاندا، هاتن شەمەندەفەری پێشکەوتووی خێرای کارەباییان خستە کار کە لە شەمەندەفەرەکانی تر تیژڕەوترە.



ئەم وێنەیە پەرەسەندنی ڕێگاوبانی سەر ووشکانی پیشاندەدات

### ب- رێگاکانی گواستنەوە بەهۆی ئوتۆمبیل:

دوای شـەڕی جیهـانی یەکـەم، کـە ئـیتر دروسـتکردنی ئوتۆمبیـلو قیرتـاوکردنی ڕێگاوبـانێکی زۆر پـەرەی سـەند، ئوتۆمبێـل بـوو بـە ڕکابـەری شـەمەندەفەر لـە بـواری گواسـتنەوەدا ئـەم ڕکابەریـەش تـەنیا لـەبواری گواستنەوەی خـەڵکی بۆ شـوێنی نزیـك بـوو.سروشـتی چـالاكیو جـەنجاڵیو گواستنەوەش، بە گوێرەی زۆریو چۆنیەتی هۆیەکانی گواستنەوە، ڕێگاوبانی قیرتـاوکراوی جۆربـەجۆری دەوێـت.بـە نموونـە، لـە وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکادا، ڕێگای لێخورینی خێرای سەر وشکانی هەیە (Highway) کە لە ئـەلمانیادا (Autobahn)ی پـێ دەڵـێنو، لـە بـەریتانیا پێـی دەڵـێن (Motorway) ئەم جۆرە ڕێگایانە پتەوو پانو قـایمن، بە ڕاسـتو چـەپدا شانبەشـان جێگـای زیـاتر شـەش ئوتـۆمبێلی تێدا دەبێتەوە،بـەم جۆرەئـەم ڕێگایانـە بەشـێوەیەکی چـاکتر خزمـەتی چـالاکی هاتوچـۆ دەکەن،هاتوچـۆو گواسـتنەوەش بـەهۆی ئوتۆمبێلـەوە ئـەوەی باشـە کـە خێراتـرەو زۆرتـر سەربەستەو ڕێگای ناگیرێت.



ئەم وێنەیە پەرەسەندنی ڕێگاوبانی سەر ووشکانی پیشاندەدات

ج- گواستنەوە بە لوولەکێشی(بۆڕی):



ئەم وێنەیە لولەکێشی نەوت پیشاندەدات

مرۆڤ لە زووەوە لوولەکێشی(بۆڕی) بۆگواستنەوەی ئاو بەکارهێناوە بەڵام بەکارهێنانی لوولەکێش وەك هۆکارێکی گواستنەوەبایەخێکی ئەوتۆی نەبووتا نەوت دۆزرایەوەو ئەوسا خواست وپێویستی بازاڕی جیهانی بۆئەم سەرچاوەیە زیادی کرد،بۆیە لوولەکێشی بۆگواستنەوەی نەوت کەوتە کار.

یەکەم جار، لوولەکێشیی بە درێژی ١٥کم و بە تیرەی (٢٠) گرێ، لە ساڵی ١٨٦٥دا دامەزرا، هەروەها لە وڵاتە نەوت دەرهێنەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا، لە عێراقو سعودیەدا، نەوت بە لوولەکێشی لە بیرە نەوتەکانەوە گەیشتە بەندەرەکان، لە ساڵی ١٨٨٥ یشدا بەکارهێنانی لوولەکێشی بۆ گواستنەوەی گازی سروشتی هاتە مەیدانو، لە هەمان ساڵیشدا هێلێکی لوولەکێشی بۆ گواستنەوەی گازە بیرەکانی شاری کاین (پەنسلڤانیا)و شاری بافالۆ (نیویۆرك) بە درێژایی ١٤٠کم هاتە دامەزراندن.

تێچوونی گواستنەوەی گاز بەهۆی لوولەکێشیەوە لەتێچوونی گواستنەوەی بەهۆی شەمەندەفەرەوە لە ٥٠٪ - ٦٧٪ی کەمترە، گواستنەوە بەهۆی

لوولەکێشی لەهەموو بارێکی سەختو ناهەمواری ئاوهەوادا پەکی ناکەوێتو مەترسیشی کەمترە. لەگەڵ ئەمانەشدا هێشتا لە کەموکوڕی بەدەر نییە، چونکە ئەم لوولانە لە هەندێ شوێندا ناچار بە چەند وڵاتێکدا دەڕوات، کە ئەگەر پەیوەندیی نێوانیان بێ هێزبوو لەوانەیە پەشیمانی لە دوا بێت.

## ٢- ڕێگا ئاوییەکان:



ئەم وێنەیە ڕێگای هاتوچۆی ئاوی پشاندەدات

مرۆڤ یەکەم جار کە ویستی سواری پشتی ئاو بێت بە ڕووبارەکان خۆی تاقیکردەوە چونکە ڕووبار هێمن ترەو سنووریشی دیاریکراووئاشکرایە بەپێچەوانەی دەریاکان کەپڕن لەمەترسی و ڕێگای هات ونەهات.بۆ پەڕینەوە لەنێوان هەردوو بەری ڕووبار مرۆڤ یەکەم جار داری بەکارهێنا،ئینجا پێشکەوت بۆ کەڵەك وبەلەمی لەدار دروستکراو دواتریش سەوڵ وچارۆگەشی خستەکار،دواتریش هێزی هەڵمی بەکارهێنا بۆ کەشتی کەئەمەشیان وای کرد کەشتیەکان بەخێراییەکی زیاتر و بە بارێکی زۆرتروگەورەتر دەریاوزەریاکان ببڕن،ئەوەش لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدە بوو تا باری کەشتیەك گەیشتە نیوملیۆن تەن وئێستاش ملیۆنەهایە.

گواستنەوەی ئاوی(ڕێگا ئاوییەکان) دابەش دەبێت بۆ دوو بەش:

### أ- گواستنەوەی دەریایی:

گواستنەوەی دەریایی چەند خەسڵەتێکی باشی هەیە،وەك ئەوەی کە کرێی گواستنەوەی شمەك کەمترە لەچاو هۆیەکانی تری گواستنەوە چونکە کەشتی باروبارخانەیەکی زۆرو گەورەوگران دەگرێتو،دەشتوانرێت بارکردنو بارداگرتنیشی بە ئامێر ئاسانتربکرێت. خراپیەکەشی ئەوەندەیە کە باری هەواو گوژموتەکانی نالەباری ئاو جارجار تووشی دەبێتو لەوانەیە خێراییەکەی کەم بکاتەوە.خۆئەگەر هاتوو تووشی رەشەباو تۆفان بو ئەوە رەنگە رێگای لێ بزر بکاتو لە رێگەکەی خۆی لای بدات. لەگەڵ ئەوەشدا گواستنەوە بەهۆی کەشتییەوە هێشتا هەر لەهۆیەکانی تری گواستنەوە باشترە بەهۆی پێداویستی زۆر بۆگواستنەوەی کەلوپەل وشمەك لەنێوان ناوچە جیاجیاکانی جیهان.

### ب- گواستنەوە لە ڕووبار:

ڕووبارەکان بۆهاتوچۆی ئەوکەشتیانە بەکاردەهێنرێن کەقەبارەیان بچووکترە لەچاو کەشتی دەریایی،بەڵام لەوناوچانەی کەچالاکی پیشەسازی وبازرگانی تێدا جمەی دێت ئەوا ئەو کەشتیانە بایەخێکی گەورەیان هەیە وەك لە رووبارەکانی مسیسپی و ڤۆلگا و دانوب و نیل.

### ٢-ڕێگای ئاسمانیەکان:

مرۆڤ هەوڵی زۆری داوە بۆئەوەی سەر هەوا بکەوێت،ئەوەبوو لەچارێگی کۆتایی سەدەی نۆزدە لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکان (باڵۆن) ی دروستکرد بۆیە ئەم سەردەمە بەسەرەدمی (باڵۆن)ناسرا،یەکەم باڵۆنیش ساڵی ١٨٧٢ هەڵدرا بۆئاسمان دوای ئەوەی پرکرا لەهەوای گەرمی داخ تیرەی ٣٥ پێ بوو (١٠) دەقیقە لە ئاسمان مایەوە.لەهەوڵی دووەم دا غازی هایدرۆجین کرایەنێو

بالۆن وئەمجارەیان بۆ نزیکەی (٤٥) دەقیقە لە ئاسمان مایەوە.دوای ئەمانە هەوڵێکی زۆردرا بۆ دروستکردنی ئامێرێك کەبتوانێت بفرێت تاساڵی ١٩٣٠ کەبەساڵی پەرەسەندنی فڕۆکە دادەنرێت چونکە لەو ساڵەدا دەستکاریەکی زۆری فڕۆکە کراو چاکتریان کرد لەبەرئەوەی فڕۆکە هۆکارێکی گرنگی گواستنەوەیە.دوای ئەوەی کە گواستنەوەی ئاسمانی زۆربە خێرایی پێشکەوت وگۆڕانکاری گەورەی تیاداکرا ئەمانە بوونەهۆی ئەوەی کاریگەریان لەسەر زیادبوونی خێرایی وبڕینی ماوەیەکی زۆرتر ودووردرێژتر هەبێ بێ ئەوەی سووتەمەنی لێ ببڕێتو بەرزتریش بفڕێت. لەگەڵ ئەمانەشدا،بەرزبوونەوەبۆ ئاسمان سنووری خۆی هەیەو،فڕۆکە ناتوانێت لەوسنوورە بەرزتر بفڕێت، ئەمەجگە لەگیروگرفتی هەڵدێرو چاڵاییەکان (الانخفاضات)ی ناو هەوا کە تەگەرەی دەخاتەڕێ، هەروەها تەموومژیش چالاکی فڕۆکە کەم دەکاتەوە،لەگەڵ بەرزیی تێچوونی گواستنەوەی ئاسمانی. سەرەڕای ئەوانەش فڕۆکە لە گواستنەوەی خەڵکیو باری بازرگانی جیهاندا هاوبەشیەکی باش دەکات.




ئەمە نەخشەی گواستنەوە وڕێگاوبانی ئاسمانی جیهانییە

## بەندەرەکان و بایەخیان:



ئەم وێنەیە بەندەرێك پیشاندەدات

بەنـدەر لـە جێگایەکدا دادەمـەزرێت کـە داڵدەئاو (مرفـأ)ی سروشـتی یـان دەسـتکردی هــەبێت، کــەبتوانن کەشـتییە لەنگــەرگرتوەکان بپــارێزن لــە گەردەلولە سەخت و شەپۆڵە دژوارەکان ، لەو بەندەرانەدا هـەموو خزمـەتێك بۆ کەشتیو کەشتی سواران‌و شمەکی بازرگـانی ئامـادەکراوە. پێویسـتە لـەو بەندەرانە حەوزو دەزگای چاککردنەوەی کەشتیو زەرەردارو شکاویشی تێدا هەبێت، هەروەها کۆگای تاقتکردن‌و پاراستنی شمەکی بازرگانیشی پێویستە لێ بێت، بەندەرەکان جۆراوجۆرن‌و بە گوێرەی ئـەرك‌و فرمـانی هـەر یەکـەیان لێـك جیـان، لەبـەر ئـەوە بـە گـوێرەی ئـەم فرمانانـەیان بـەش بـەش‌و جـۆر بەجۆرن‌و دەکرێن بەم جۆرانەی خوارەوە:

١. بەندەری بازرگانی: بەندەرە بازرگانیەکان ڕۆڵێکی گرنگ لەئاسانکردنی کردارەکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەبینن،گرنگی بەندەری بازرگانی لەو ڕۆڵە سەرەکیەوە دێت کە شوێنەکەی دەیبینێ،ئەم گرنگیەی شوێنەشی لەوەدا دەردەکەوێت کە بکەوێتە سەرهێڵی هاتوچۆی کەشتیەکانی دەریاوانی جیهانی،لەدیوی دواوەش چەند خزمەتی بازرگانی دەگەیەنێ ، لەوانەشە خزمەتگوزاریە بازرگانیەکانی بگاتە زۆر دوور لەسنوری وڵاتەکە،بۆیە قەرەباڵغیەکی زۆری جموجۆڵی هاتوچۆ لەم بەندەرانە دەبینرێت،وەك بەندەری بەیروت کەلەدیوی دواوە خزمەتێکی زۆر دەگەیەنێت بە وڵاتەکانی سوریا و ئوردن وعێراق و کوێت،کەچی بەندەری بۆرسەعید تەنها خزمەتی بازرگانی میسر دەکات.

٢. بەندەری جەنگ: ئەم بەندەرانە لەو شوێنە دەریاییە دادەمەزرێن کەوا کەشتی سەربەستی جموجۆڵی هەبێت و دەوڵەتانیش بتوانن پارێزگاری لێ بکەن لە کاتی بەرگری و هێرشکردن دا،بۆیە دەوڵەتانیش ئەم شوێنانەیان کردووە بە بەندەر بۆ لەنگەرگرتنی کەشتیە جەنگیەکانیان،و دەخرێنە ژێر چاودێری بۆئەوەی نهێنی سەربازی نەچێتە دەرەوە، بۆیە کەشتیە بازرگانیەکان هیچ خزمەتێك لەم جۆرە بەندەرانە پێشکەش ناکەن زۆربەکەمی نەبێت.

٣. بەندەری ڕاو: ئەم جۆرە بەندەرانە خزمەتگوزاری پێشکەش بە کەشتیەکانی ڕاوکردن لەناوچەکەدا دەکەن،زۆربەی ئەو بەندەرانەش لەو ژینگانە دادەمەزرێن کە ڕاوی دەریایی پیشەی سەرەکی دانیشتوانی ناوچە دەریاییەکانە،وەك بەندەرەکانی دورگەی ئایسلەندەوبەندەری ئەبەردین لە بەریتانیا.

٤. بەنــدەری تــاقتکردن (خــەزنکردن): ئــەم بەندەرانــەش بــە ئــەرکی ناوەندگیری بازرگانی هەڵدەستن لەنێوان دوو دەوڵەتدا کە پەیوەندی ئابووری نێوانیان وەستابێ،بۆیە ئـەم بەندەرانـە هەڵدەسـتن بـەکردارەکانی داگـرتن و بارکردن، کەلوپەل و شمەکی هەردوولایان تاقت دەکەن دووبارە هـی ئـەمیان بۆئـەویان هــی ئــەویان بــۆ ئــەمیان دەنێرنــەوە وەك بەنــدەری لێڤــەرپول وکۆپنهاگن.

٥. بەندەری خەڵووز: ئەم بەندەرانە لەسەر هێڵە دەریاوانە دوورودرێژەکان بڵاوبونەتەوە،کەشتیەکان لادەدەن لای ئەم بەندەرانـە بۆئـەوەی سـوتەمەنی وئاوی خواردنەوەوسازگار وپێویستی تریان بەدەست بێنن نەك بـۆ بـارداگرتن وبارکردن،بۆیە لەم بەندەرانە کۆگایەکی زۆری سوتـەمەنی هەیە،وەك بەندەری جەبەل تاریق و بۆرسەعید و کۆلۆمبۆ.

٦. بەندەری نەوت: لەم بەندەرانەوە نەوت ڕەوانەی دەرەوە دەکرێت دوای ئــەوەی نــەوتی بــە لوولەکێشــی لــەبیرە نەوتەکانــەوە بۆدێــت،گرنگی ئــەم بەندەرانـە دەوەسـتێتە سـەر قـەبارەوبڕی ئـەو نەوتـەی کـە لەبەندەرەکـەوە ڕەوانەی دەرەوە دەکرێت وەك زەهرانی وبانیاس ورأس التنورة.

## ڕێگا سەرەکییەکانی گواستنەوەی دەریایی لە جیهاندا:

چەند ڕێگەیەکی سەرەکیی دەریا لە جیهاندا هەیەو هەندێکیان ئەمانەن:

١. ڕێگا زەریاییەکانی بەشی باکووری زەریای ئەتڵەسی.

٢. ڕێگا زەریاییەکانی بەشی باشووری زەریای ئەتڵەسی.

٣. ڕێگا زەریاییەکانی زەریای هێمن (باسفیك).

٤. ڕێگا زەریاییەکانی زەریای هیندی.

٥. ڕێگا دەریاییەکانی دەریای سوورو دەریای ناوەڕاست.




لەم نەخشەیەدا ڕێگای دەریاییەکانی جیهان پیشاندەدات

## ١. ڕێگا زەریاییەکانی بەشی باکووری زەریای ئەتلەسی:

بەشی باکووری زەریای ئەتڵەسی بە بوارێکی زیندووی دەریاوانی جیهانی دادەنرێت، چونکە فراوانترین جموجۆڵی کەشتییەکانی نەوتو کەشتیی گواستنەوەی شمەك وڕێبواران لەو بەشەدا بە قەرەباڵغییەکی ئەوتۆ دیارە کە ٤٠٪ی هەموو دەریاوانی جیهانی گرتۆتەوە،و ٧٥٪ی کردارەکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی بەسەر ئەم زەریایەدا گوزەر دەکات بەهۆی ئەوەی بەدرێژایی ساڵ کەناراوەکانی بۆ دەریاوانی کراوەن لەبەرئەوەی کە تەوژمە گەرمەکەی کەنداو دەگاتە کەناراوەکانی ، سەرەڕای ئەوەش بەم بەرو ئەوبەری کەناراوەکانییەوە چ لە ڕۆژهەڵات، چ لە ڕۆژئاواوە وڵاتی دانیشتوان زۆر ودەوڵەمەندو گوزەران ئاست بەرز وخاوەن ئابووریی پڕ توانای لێیە کە توانای کڕینیان زۆرەو شمەکی بازرگانی زۆر دەکڕنو بازاڕەکان گەرمن. لەبەر ئەوە هەلێکی تەواو بۆ دامەزراندنی بەندەر لە هەردوو کەناراوی ڕۆژئاوا و

رۆژهەڵاتیدا رەخساوەو پەیوەندیو رێگای دەریایی لەنێوان بەندەرەکانی رۆژئاوای ئەوروپا بە بەندەرەکانی رۆژهەڵاتی ئەمریکای باکورو بەندەرەکانی دەریای کاریبی دا کراوەتەوەو فراوانترینی چالاکی دەریاوانی لەم بەشەی ئەو زەریایەدا کۆبۆتەوە.

٢. رێگا زەریاییەکانی بەشی باکووری زەریای ئەتلەسی:

لەم بەشەی زەریای ئەتڵەسیدا چالاکی سەر رێگا زەریاییەکان کەمەو کەشتیی کەم پێدا دەرواتو ئاڵوگۆڕی بازرگانی کەم بەسەرەوەیە، چونکە دەوڵەتانی سەر کەناراوەکانی ئەمبەرو ئەوبەری، وڵاتی تازەپێگەیشتوونو ئاستی گوزەرانی گەلەکانیشیان نزمەو بەروبوومی هەموشیان وەکو یەك وایەو چونیەکە. جگە لەوەش نۆکەندی سویسو نۆکەندی پەناما بوونەتە هۆی ئەوەی کە کەشتییەکان کەمتر بە رێگا دوورەکەی (رأس الرجاء الصالح) و سەری (هۆرن)ی باشووری ئەمریکا باشووردا بڕۆنو، زۆرتر بە دوو نۆکەندەکەدا هاتوچۆ بکەن.

٣. دەریاوانی ناو زەریای هێمن:

جموجۆڵی هاتوچۆی دەریاوانی لە زەریای هێمن ئەوەندە کەمە کە لە ١٤٪ی هاتوچۆی بازرگانی جیهانی زیاتر نییە، چونکە لەبەری ئەمریکاوە ڕیزە چیاکانی رۆکی، بە درێژایی کەناراوەکانی گرتووەو، رێگای بەرفراوانییەکانی پشتەوەشی لە بەندەرەکان بەستووە.

لە بەری ئاسیاشەوە، بەدرێژایی کەناراوەکانی زەریای هێمن هەمووی دەوڵەتی ئیشتراکییەو رامیاری خۆبژێوی (الاکتفاء الذاتي) یان لەبواری ئابوورییدا گرتووە، ئەمەش چالاکی ئاڵوگۆڕی بازرگانی لەنێوان هەردوو کەناراوەکەی زەریای هێمندا تەواو کەمکردۆتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا لە

کەناراوەکانی خۆرئاوای زەریاکە، چالاکی دەریاوانی هەر لە کەنەدا(ئەمریکای باکور) بیگرە تا دەگاتە بەندەرەکانی شیلی( لە ئەمریکای باشوور) بە گەرمی هەیە.

رێگایەکی زەریاییش لە کەناری رۆژئاوای شاری (لۆس ئەنجلۆس)ەوە دەست پێ دەکات، تا دەگاتە شاری یۆکۆهاما لە یابان، بەلآم ئەم رێگایە کەنارەو کەنار ناڕوات.

### ٤. رێگا زەرياييەكانی ناو زەريای هيندی:

ئەم زەریایە وەکو زەریاکانی تر نییەو لە باکوورییەوە داخراوە، کەچی هەرلە بەشەکانی باکوورییەوە زیادە پەلی لێ پەیدا بووە بەرەو دەریای سوورو کەنداوی عەرەبو کەنداوی بەنگال. زۆربەی دەوڵەتانی سەر زەریای هیندی، لە رووی هەلومەرجی ئابووریو پلەی گەشەکردنی پیشەسازییەوە وەکو یەکن، چونکە دەوڵەتی تازەپێگەیشتوون و کەرەستەی خاویان هەیە، لە هەمان کاتیشدا بازارێکی گەورەنو بەروبوومو شمەکی پیشەسازیی دەوڵەتە پیشەسازییەکانی تێدا ساغ دەبێتەوە، بەتایبەتیش هی یابانو وڵاتە یەککگرتووەکان.

چەند رێگایەکی زەرياييش لەنێوان ئەو وڵاتانەدا هەیە کە بەسەر زەریای هیندی دا دەڕوانن، یەکێك لەو رێگایانە ئەوەیە کە بە گەرووی (باب المندب)دا تێ دەپەڕێتو لقێکی دەگاتە کاب واتە رأس الرجاء الصالح و ئەوی تریان دەگاتە هیندستانو سری لانکاو بۆرما و ئەندەنوسیا، شمەکی لە خۆزیادی ئەم وڵاتانە بەم رێگایەدا دەڕواتو لەنێوانیاندا ئالوگۆڕ دەکرێت.

گەرووی (مەلقا)ش ئالوگۆڕی بازرگانی لەنێوان رۆژهەلآتی ئاسیاو ئوسترالیادا دابین دەکاتو دەشگاتە دەریای سوور.

### ٥. ڕێگا دەریاییەکانی دەریای سوورو دەریای ناوەڕاست:

دەریاوانی جیهانی لەم دوو دەریایەدا بریتیە لە هەموو ئەوژمارەی کەشتیو پاپۆڕو قەبارەی بازرگانییە جیهانییەی کە بەم دوو دەریایەوە گوزەردەکەن، گرنگی ئەم دوو دەریایەش لەوەدایە کە چەند گەروویەکیان هەیە، ئەم دوو دەریایە بە دەریاو زەریاکانی جیهانەوە دەبەستنەوە،واتە گەرووی (باب المندب)و (گەرووی جەبەل تاریق) کە لەم دوو دەریایەدان هەموو ئەو ڕێگا زەرییایانەیان دێتەوە سەر کە لە زەریای هیندیو زەریای ئەتلەسییەوە دێن،هەروەها بایەخێکی زۆر گەورەشیان لە بەڕێ خستنی نەوتی ناوچەی کەنداو دا هەیە، کە بەسەر پشتی ئەم دەریایانەدا دەڕواتو دەنێردرێت بۆ بەندەرەکانی ئەوروپاو ئەمەریکا، لە بەندەرەکانی ئەوروپاو ئەمریکاشەوە شمەکی بەرهەمهێنراو و دروستکراو و بەکاربردن، هەر بەم ڕێگەیەدا دێتو دەگاتە ولاتانی عەرەبو ولاتانی ڕۆژهەلاتی ئەفریقیاو باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا.

## بەشی هەشتەم

### دانیشتوان و نیشتەجێبوون

#### زۆربوونی دانیشتوان:

ژمارەی دانیشتوانی جیهان بەپێی نوسینگەی ئامارووسەرژمێری نەتەوە یەکگرتوەکان لە ١٢ی ئازاری ٢٠١٢ زیاتر لە ٧ ملیار کەس بوو، زۆربوونی خێراو سەرسوڕهێنی دانیشتوانی جیهانیش لەناوەراستی سەدەی حەڤدەهەمەوە دەستی پێ کرد(لە ساڵی (١٦٥٠) بۆ ساڵی (١٨٥٠) )واتا لەو ماوەیەدا دانیشتوانی جیهان بوو بە دوو ئەوەندەی کە هەبوون چونکە لەنیو ملیار کەسەوە لەو ماوەیەدا بوو بە ١,١ ملیار کەس. ئەوەندەشی پێ نەچوو ئەم ژمارە تازەیەش دوو ئەوەندەی لێ هاتو لە ساڵی (١٩٧٠)دا دانیشتوانی جیهان گەیشتە ٣٦٣٥ ملیار کەس. خۆ ئەگەر تێکڕای زۆربوونی دانیشتوانی جیهان بەو پێیە زیاد بکات کە ئێستا هەیە، واتا (١,٨٪)، ئەوا دانیشتوانی جیهان لە ماوەی سەد ساڵدا شەش ئەوەندەی لێ دێت کە ئێستا هەیە.

هەرچەندیشە تێکڕای گشتی زیادبوونی هەموو دانیشتوانی جیهان، بەرزە، بەڵام هی کۆمەڵەی ناوچەیەك تا ناوچەیەکی تر چونیەك زیاد ناکاتو جیاوازەو لە رەوتی پەرەسەندنی دانیشتوانی جیهانیشدا دیسان جیاوازەو وەکو یەك نییە، ئەوەتا رێژەی زیادبوونی دانیشتوانی کیشوەری ئاسیا هەمووی دەگاتە ١,٩٪و، لە وڵاتە تازەپێگەیشتوەکاندا دەگاتە ٢,١٪. کەچی لە دەوڵەتانی ئەفریقیاو لەگەڵ دەوڵەتی ئەمریکای لاتینی دەگاتە

٢,٨٪و له دەوڵەتە پێشكەوتووكانیش له ٠,١٪- ٠,٩٪ دەبێت، ئەمەش بووە هۆی كەمبوونەوەی دانیشتوانی هەندێ لەم دەوڵەتە پێشكەوتووانە، ئەوەتا دانیشتوانی ئەلمانیای فیدرال لە ساڵی (١٩٨٣)دا (٩٥) هەزار كەسی كەم كرد، هەروەها بەریتانیاش.

## گوندو شار چین‌و جیاوازییان چییه:

بۆ پێناسینی شار، چ لێكۆڵەران چ دەوڵەتانیش ڕاڕان‌و چونیەك پێناسەی ناكەن، لەگەڵ ئەوەشدا، بەپێی چەند بنچینەو پێوەرێك (شار) پێناسە كراوە، كە ئەمانەن:

١. قەبارەی ئاوەدانی: مەبەست لە قەبارە ژمارەی دانیشتوانە، هەندێ دەوڵەت بۆ ئەوەی ئاوەدانی بە شار دابنێت ڕاددەیەك بۆژمارەی دانیشتوان دادەنێت كە نابێت لەوە كەمتر بێت، دەنا ئەگەر لەوە كەمتر بوو ئەوا بە گوند(دێ)ی دادەنێت. ئەم ڕاددەی ژمارەی دانیشتوانە لە ئێرلەندە نابێت لە(١٥٠٠) كەس كەمتر بێت،بەڵام لە وڵاتە یەككگرتووەكان نابێت لە ٢٥٠٠كەس كەمتر بێت‌و لە هیندستان نابێت لە(٥٠٠٠) كەس كەمتر بێت، ئەگەر لە میصرو تایلەندو ئیسپانیاو یۆنان لە (١٠,٠٠٠) كەس كەمتر بوو ئەو ئاوەدانییە بە شار نازانن،بەڵام ئەمە پێوەرێكی وورد نییە، چونكە ناتوانرێت لە هەموو وڵاتەكانی جیهاندا، بۆناسینەوەو جیاكردنەوەی شار لە گوند پێوەرێكی یەككگرتوو بەكاربهێنرێت، بە نموونە قەبارەی دانیشتوانی ئاوەدانییەك لە عێراق كە گوندی پێ دەبێت بە شار، كەچی لەهەمان ئەو قەبارەیە لە چین گوندی پێ نابێت بە شارو هەربە گوند دادەنرێت، چونكە لە چین گوندی زۆر هەیە كە ئەو قەبارە دانیشتوانەی تێدا دەژی، هەر بەو جۆرەش لە گەلێ وڵاتانی تری

جیهاندا، لەبەرئەوە قەبارەی دانیشتوان بۆ ئەومەبەستە ناشێت و لەجیاتی ئەوە پێوەری تر دەخرێنە کار.

٢. هەندێ وڵات سیفەتی بەڕێوەبەری دەکەنە بنچینەو پێوەر بۆ پێناسینی شار، بۆ نموونە لە عێراقدا هەر ئاوەدانییەك ئەنجومەنی شارەوانی تێدابێت ئەوا شارە، ئەمەش مەرکەزی ناحیە و، لە مەرکەزی ناحیەش گەورەتر دەگرێتەوە، هەر ئاوەدانیەکیش ئەنجومەنی شارەوانی نەبێت ئەوە گوندەو بە مەرکەزی بەڕێوەبەرایەتیش دانانرێن.

لە هەندێ وڵاتیشدا سیفەتی بەڕێوەبەری ئاوەدانییەك ئەوەیە کە ئەنجومەنی دادوەری (قضائي) تێدابێت، یان سنووری بەڕێوەبەرێتی هەبێت و بەڕێوەبەرێکی لێپرسراو بیبات بەڕێوە.

٣. شێوەی دەرەوەی ئەو ئاوەدانییە و، پێکهاتنی ناوەوەی کە بریتییە لە هەموو ئەو باڵاخانەو تەلارانەی بۆ نیشتەجێبوونی خەڵکەکەی دامەزراون، یان ئەو کارگەوشوێنی بازرگانی وبانك و بینای هۆتێل و دام ودەزگای پێشکەوتووی خوێندن و پارك وباخچەگشتیەکان کە هەیە ئەوانە، شار لە گوند جیا دەکەنەوە، لەگەڵ شێوەی دروستکردن وجوانکاری و فراوانی جادە و شەقامەکان وشۆستەوئاوەڕۆ وزێراب و...

٤. ئەو خزمەتگوزاری و ئەرك و فرمانانەش کە لە شاردا پێشکەش دەکرێن لە هی گوند جیاوازە، چونکە هەرچی ئەوەی ناو شارە زۆرەو پێشکەوتووترەو تایبەتمەندترە، چونکە ژمارەی دانیشتوانی زیاترەو توانای شمەك کرینیشیان بەرزترە، کەئەمەش پێویستی بە سازکردنی بازاڕو سوپەرمارکێت و مۆڵ ودوکانی تایبەتمەند وفرۆشتن بە کۆ وسەنتەری بازرگانی هەیە. هەرچی گوندیشە ئەمانەی بۆ نالوێت و تێیدا خڕ نابنەوە.

سەرەڕای ئەوەش شار فرمانی پیشەسازیی تێدایەو، ئەو خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییانەش کە بۆ دانیشتوانی شاران ئامادە کراوە زۆر لەو خزمەتانە پێشکەوتووترن کە دانیشتوانی گوندان دەستیان دەکەوێت.

٥. ئەو پیشەیەی کە دانیشتوان پێوەی خەریکن: پیشەی سەرەکی زۆربەی گوندنشینان کشتوکاڵ و لەوەڕاندنی ئاژەڵە هەرچی زۆربەی شارنشینان بە فرمانی شارستانییەوە خەریکن وەك موچەخۆری دەوڵەت وبازرگانیو پیشەسازییو خزمەتگوزاری گرنگی تر ، لەو بەرووبوومە کشتوکاڵیو ئاژەڵیەش سوودمەندن کەگوندنشینان بەرهەمی دێنن ودەینێرن بۆ شار.

جگە لەوەی وتمان هەندێك لایەنی خۆیایەتی مرۆڤ خۆیو بەهای کۆمەڵایتیش کە پەیوەندییان بە پێکهاتە و قەبارە ودابونەریتی خێزان هەیە ئەمانەش دیسان جیاوازن لەنێوان شار و گوند.

لەبەرئەوە، دەتوانین بلێین کە شار کۆمەڵبوونێکی گەورەی دانیشتوانە لە مۆڵگەیەکی نیشتەجێبوندا کەسیفەتی بەڕێوەبەری هەیە، کە فرمانی زۆری تێدایەو، شمەك وخزمەتگوزاری تایبەت پێشکەش بە دانیشتوانەکەی ودەوروپشتیشی دەکات کە (هەرێمی شار) ی پێ دەڵێن.

هەرچی گوندە بریتیە لە کۆمەڵبوونی دانیشتوان،بەڵام سیفەتی کشتوکاڵ ولەوەڕاندنی ئاژەڵی پێوە دیارە، خانووەکانیشی شێوەو شێوازێکی تایبەتی هەیەو لە کەرەسەی ئەوتۆش دروستکراون کە لەگەڵ ژینگەکەیدا گونجاوە، خێزانەکانیشی لەناو خۆیاندا پەیوەندیی خزمایەتیو دابونەریت و ڕێزگرتن ویارمەتیدانی یەکتر و بەرچاوتێری پێکەوەیان دەبەستێتەوە. لە عێراقیشدا گوند ئەو ئاوەدانییە پڕ لە ئادەمیزادەیە کە لە ناحیە بچوکترە.

## جۆرەکانی شارو تایبەتمەندییەکانیان:

چەند بنەمایەك هەن کە پێویستە بزانرێن بۆ ئەوەی شارەکان پۆلێن بکەین و جۆرەکانیشیان بزانین، ئەم بنەمایانەش جوگرافیناسە تایبەتمەندەکان دایانناوە کە لە جوگرافیای شارەکان دەزانن کە ئەمانەن:

### ١. بنەمای جێگەو ناوچە:

جێگە ئەو سنوورەیە کە شارەکە دەگرێتەوە، ولەسەر نەخشە بازنەیەکی بچووك یان خاڵێکی بۆ دادەنێین، لێکۆڵینەوەش لە بەرزونزمیو پلەی لێژیی زەوییەکە دەکرێت کە شارەکەی لەسەر دامەزراوە، لەگەڵ پێکهاتنی جیۆلۆجیو کانیی ئاگرینو بوومەلەرزەش کە لەوانەیە بۆ دوارۆژ تووشی ئەو جێگەیە ببێت، هەروەها لە ئاووهەوای ناوخۆی شارەکەو دەرامەتی ئاوی پاكو، لە دووریو نزیکی ئەو ئاوە لە شارەکەو، لە قایمیو چرووکیی تاوێرو بەردی بن شارەکە کە ماڵەکانی لەسەر دامەزراوە، لەوانە هەموو دەکۆڵرێتەوەو بە ووردی دەخوێنرێن.

هەرچی ناوچەیە، ئەوا فراوانترە، چونکە ناو شارەکە ودەوروپشتی شارەکەش دەگرێتەوە کە هاموشۆو پەیوەندییان لەگەڵ شارەکەدا هەیە، ودەوری شارەکەیان داوە، هەمان ئەو لێکۆلینەوانەش کە جێگەی شارەکە کران، لە ناوچەی شارەکەشدا دەکرێن بەلام بەشێوەیەکی فراوانتر، لەگەڵ لێکۆڵینەوەی ئاووهەواو خاكو لەباری خاکەکەی بۆ کشتوکاڵو، کاری زەویەکەش لە رێگاوبانی هاتوچۆکردن. ئێستا دوای ئەوەی لە واتای جێگەو ناوچەی شار تێ گەیشتین، دێینە سەر ئەوەی کە ئەم بنەمایە بکەین بە پێوەرێكوشارە جۆربەجۆرەکانی پێ بناسینو جیایان بکەینەوە. بەو پێیە شارەکان دابەش دەبن بۆ ئەم جۆرانە: شاری سەر رووبارەکان، شاری ناو

چیاکان، شاری ناو دەربەندەکان، شاری دەشتاییەکان، شاری کەناراوەکان، شاری دامێنی چیاکانو...هتد.

٢. بنەمای قەوارە:

مەبەست لە بنەمای قەوارەی شار ژمارەی نشینەی شارەکەیە، بەم پێیە، شارەکان ئەم جۆرانەن:گچکە شار Town شار City گەورە شار Metropolis. مێگەلە شار Meglapolis بریتییە لە چەند شارێکی نزیك لە یەكو گەورەبوونو یەك شاری گەورەیان لێ پەیدا بووە. جگە لەم جۆرە شارانە، مۆڵگەی شارستانێتی گەورە Super- cities هەیە کە شاری دانیشتوانی ملیۆنەهان، هەریەکەیان لە بیست ملیۆن کەسی زیاتر تێدا دەژی، وەکو شاری نیویۆرکو تۆکیۆ.

٣. بنەمای کار و فرمان:

ئەم بنەمایە، لە هەموو بنەماکانی جیاکردنەوەی شاران، گرنگترەو باشتر شارەکانی پێ دەناسرێتەوە، چونکە هەموو شارێك کارو فرمانی جۆربەجۆری تێدا هەیە، لە بازرگانی وپیشەسازی و گەشتوگوزاری و خزمەتگوزاری، لە پاڵ کار وفرمانی سەرەکی کە دابین کردنی جێگەی نیشتەجێبوون وحەوانەیە بۆ دانیشتوان بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا دەبێ کار وفرمانێك یان زیاتری تێدابێت کە پێی بناسرێتەوە وجیای بکاتەوە لەگەڵ شارەکانی تر، بۆنمونە زۆرترین خەڵکەکەی بە کاروفرمانێکەوە خەریکن تا ئەو رادەیەی کە شارەکە بەو کاروفرمانەوە دەناسرێتەوە،وەك ئەوەی دەڵێین، ئەمەشارێکی پیشەسازییە یان شارێکی بازرگانییە...

وا لە خوارەوەش روونتر باس لە جۆرەکانی ئەو شارانە دەکەین:

### أ- شاره بازرگانییه‌كان:

فرمانی بازرگانی به فرمانی سه‌ره‌كی ئه‌و شارانه داده‌نرێت ،ئه‌م شارانه ئه‌و جموجۆڵه بازرگانیانه ئه‌نجام ده‌ده‌ن كه خزمه‌ت به‌دانیشتوانی شاره‌كه‌و ده‌وروپشتی شاره‌كه‌و دوور له‌شاره‌كه‌ش بكات ، ئه‌وه‌ش له‌سه‌ر قه‌باره‌وگه‌وره‌یی بازاڕه‌كان (سه‌نته‌ره بازرگانییه‌كان) و پله‌ی پسپۆریی له‌شاره‌كه وه‌ستاوه . شاره بازرگانییه‌كان چه‌ند جۆرێكن، جۆرێكیان بازاڕه شاری ناوچه‌یین، ئه‌مانه گچكه شاری وه‌كو مه‌حمودییه، موسه‌ییه‌ب، فه‌للوجه، ئه‌بولخه‌سیب، كفری‌و مه‌خمورن، جۆرێكی تریشیان بازاڕه شاری هه‌رێمین، ئه‌مانه له‌وانی تر گه‌وره‌ترن‌و چالاكی بازرگانیی جۆراو جۆرترو زیاتریان تێدا هه‌یه، ئه‌مانه به‌غدادیان لێ ده‌رچێت، هه‌موو مۆڵگه‌ی پارێزگاكان له‌م جۆره شاره‌ن.

جۆرێكی تر هه‌یه شاری بازرگانیی جیهانییه كه جموجۆڵێكی بازرگانی به‌رفراوانی له‌سه‌رئاستی جیهانیی، ئه‌م جموجۆڵ وئاڵوگۆڕیه بازرگانییه به‌رفراوانه، چالاكی دارایی و بانككاری چڕو پڕی ده‌وێ، وه‌كو شاری نیویۆرك، له‌نده‌ن، مۆسكۆ، قاهیره، پاریس‌و تۆكیۆ.

### ب- شاره پیشه‌سازییه‌كان:

ئه‌و شارانه‌ن كه پسپۆڕوتایبه‌تمه‌ندن له به‌رهه‌مهێنانی شمه‌كی گه‌وره‌ی پیشه‌سازی ، ئابووریه‌كه‌شی به‌پله‌ی یه‌كه‌م له‌سه‌ر به‌رهه‌می پیشه‌سازی وه‌ستاوه. له ده‌ڤه‌ری ئه‌م جۆره شارانه‌دا پێویسته بنه‌ماوهۆكاری جۆربه‌جۆری دامه‌زراندنی پیشه‌سازی هه‌بن، هه‌ر له كه‌ره‌سه‌ی خاوو ، ووزه‌وسوته‌مه‌نی ، وده‌ستی كارگه‌ر، وبازاڕ تا ده‌گاته سه‌رمایه‌و هاتوچۆ و گواستنه‌وه‌ی ئاسان.

نەخشەكێشانی دەزگاكانی پیشەسازی بە شێوەیەكی هاوچەرخ ئەوەیە كە ئەو دەزگایانە بگوازرێنـەوە بـۆ دەوروبـەری شـارەكەو كارگـەی تـازەش هـەر دوور لە شارەكەوە دابمەزرێت‌و رێگاوبـانی بەسـەر شارەكەشـەوە هـەبێت بـۆ ئـەوەی شـارەكە لـە پیسـبوون بپارێزرێـت، بـەلاَم نوسینگەوئۆفیسـەكانی فرۆشـتن‌و دابەشـكردن‌و پـارەداركردن و دەزگاكـانی پارەگۆڕینـەوەو بانـك‌و شـتی تـر، ئەمانـە هـەمووی لـە نـاو شـارەكاندا بمێننـەوە، جگـە لەوانـە خزمەتگوزاری بازرگانی‌و حەوانەوەو پشوو بۆ كرێكارانی دەروبـەری شـارەكە پێویسـتە هـەبێت ، نموونـەی ئـەم جـۆرە شـارانەش لیـۆن لـە فەرەنسـاو مانشستەرو لیڤرپۆل لە بەریتانیاو ئەسكەندەریە لە میسر.

ج- شارە جەنگییەكان:

فرمانی جـەنگی فرمـانێكی تـرە، كـە پێویسـتە بـۆ پاراسـتنی ژیـانی خەلَكی شارەكەو شارەكەش خۆی لەكاتی هێرش و ڕووبەڕووبونـەوە ئامـادە بكرێت. شـاری جـەنگی تـەنیا ئـەركی جـەنگی لەسـەر شـانەو ئـەو ئەركـەش سەرەك فرمانی شارەكەیەو ژیان‌و پەرەسەندنی شارەكەشی لەسەروەستاوە. لەبـەر ئـەوە زۆربـەی دانیشـتوانی ئـەم جـۆرە شـارانە بـریتین لەسـەربازو خێزانـەكانیان، ئەوانـەش كـە بـە شـەقام‌و بازاڕەكانیـدا دێـن‌و دەچـن زۆرتـر سـەربازن.شـارە جەنگییـەكان شـوێنەكانیان بـە پێـی فرمـانی دەستنیشـان دەكرێ،هەیانە لەو سنوورانە دادەمەزرێن كەمەترسییان بەسەرەوەیە،وهەیانە لەشوێنی بەیەكگەیشتنی ڕووبارەكان یان لەشوێنی گەیشتنی ڕووبار بـەدەریا وكەنـداو دادەمـەزرێن وەك شـاری بەسـرە لـەعێراق وشـاری بۆرسـەعید لـە میسر،وهەیانە لەدەربەندی چیایەك دادەمەزرێ وەك شاری بلفۆر لەفەرەنسـا وشاری بونا لەهیندستان.جۆرێكی تری شاری جەنگی هەیە كە پێی دەوترێت

شاری قەڵا کەلەسەر گرد وبان وچیاکان بنیاد دەنریّ وەك شاری هەولێر وکەرکوك و...

### د- شارە کانزاییەکان:

ئەم جۆرە شارە لە هەلومەرجی شوێن بەدەرەو زیاتر سەربەخۆیە، چونکە شاری کانزاکاری زۆرتر دەکەوێتە شوێنێکەوە کە لەرووی سەرچاوەی خۆراكو هاتوچۆوە گونجاو نییە، سیفەتی شاری کانزاکاری ئەوەیە کە خێرا دادەمەزرێت، بەڵام بە بچووکی دەمێنێتەوەو دانیشتوانی لە چەند هەزار کەسێك تێ ناپەڕێت مەگەر بە دەگمەن نەبێ، ژیانیشی بە بوونی کانزاوە بەستراوەتەوە، کە کانزاکە نەما قەوارەی شارەکەش دەوەستێتو زۆربەی ماڵەکانیشی چۆڵی دەکەن، یان بە گشتی جێی دێڵن، ئەوسا بە(شاری خێو= تارمایی) Ghost- Town دەناسرێت.

بەڵام هەندێك شاری کانزاکردن باروذۆخێکی وەهای بۆ دەرەخسێت کە قەبارەی گەورەتروفراوانتر بێت، وەکو شاری (بڕۆکن هڵ)ی پڕ لەکانە قورقوشمەکەی ئوستڕالیاو، شاری (کەمبرلی)ی بە ئەڵماس ناودارەکەی باشووری ئەفریقا.

### هـ- شارە بەڕێوەبەریەکان و رامیاریەکان:

ئەم جۆرە شارانەش مۆڵگەی هەرێمەکانن، وەك مۆڵگەی پارێزگاکان یا مۆڵگەی ویلایەتەکان یان پایتەختی دەوڵەتەکان کە پەیوەندی دەوڵەتەکە لەگەڵ دەوڵەتانی تردا رێك دەخاتو بە گشتیش کاروباری وڵاتەکە بەڕێوەدەبات،وەك شارەکانی واشنتۆن وئەنقەرە و بێرن.باشترین جۆری پایتەختیش لەرووی جوگرافیەوە ئەوەیە کەبکەوێتە ناوەراستی دەوڵەت وەك مەدرید و پاریس.لەوانەشە پایتەختەکە بکەوێتە شوێنێکی پەراوێزی دەوڵەت

وەك ریـۆدی جـانیرۆ وقـاهیرەوپراگ.هەنـدێ شـاریش گرنگـی خۆیـان وەك پایتـەخت لەدەسـت نـادەن لـەژێر رۆشـنایی فاكتـەری مێـژوویی وەك شـاری دەلهـی كەلەكۆنـدا پایتـەختی هیندسـتان بـوو بـەڵام ئیسـتعماری بـەریتانی پایتەختی گواستەوە بۆ كلكتا كەچی دوای سـەربەخۆیی جارێكی تـر دەلهـی كرایەوە بـە پایتەخت،هـەروەها ئەنقـەرە پایتـەختی حیسیەكان بـوو بـەڵام عوسمانیـەكان ئیسـتەنبوڵیان كـردە پایتەخت،كەچـی دوای دامەزرانـدنی توركیای نوێ جارێكی تر ئەنقەرە كرایەوە بە پایتەخت.

و- شارە رۆشنبیریەكان:

ئـەم جـۆرە شـارانە لەوانەیـەفرمانی رۆشـنبیری وەك فێركردنیـان هـەبێ، وەك شـارە زانكۆكـانی ئۆكسـفۆردو كـامبریج لـە ئینگلتـەرەو هالیفـاكس لـە كەنـەدا و علیكـر لـە هیندسـتان، زانكـۆی ئـەم شـارانە بڕبـڕەی پشـتی ژیـانی ئـابووریی شـارەكەن، چـونكە زۆربـەی دانیشـتوانی شـارەكە سـەر بـە زانكۆكـەن، وپشـووی هـاوینیش لـەم شـارانەدا وەرزی مـردووی ئـابووری شـارەكەیە، قەبارەشـی لەسـەر ژمـارەی قوتابیـانی زانكۆكـانی وەسـتاوە. لەوانەشـە فرمـانی رۆشـنبیری هونـەرییان هـەبێ، ئەوسـا بـە شـارەكە دەڵـێن شـاری هونـەری، وەكـو شـارە پـڕ لـە مۆزەخانەكانی بوندوقییە(ڤینیسیا) و قورتوبەو ئەسینا.

ز- شارەكانی دڵگرانەوەو گەشت وگوزار:

ئەم شارانە هەموو خزمەتێكی دڵخۆشكەرو حەوانەوەی تێدایە بۆئەوەی پێشكەشی گەشتیارانی بكات. ئەم جۆرە شارانە بێگومان لە رووی هەڵكەوتەی سروشتییەوە بۆ ئەو جۆرە كارە گونجاوەو، ئاووهەوای مامناوەند یان ساردە، دیمەنی شیرینو دڵرفێنی زۆرەو شان بەشان كەناراوەكانیشی

ڕیزە چیای ڕەنگین بە هەموو کەنارە دەریاکەی کشاوە. ئەم جۆرە شارانەش هەندێکیان سەیرانگای زستانەن، وەکو شارەکانی نیس‌و کان‌و مۆنتیکارلۆ و مۆناکۆی سەر ریڤیرا لەفەرەنساو، سان ریمۆی سەر ریڤیرا لەئیتالیاو، میامی لە ویلایەتی فلۆریداو لۆس ئەنجلۆس لەویلایەتی کالیفۆرنیا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو، ئەسوان لە میسر و شاری صحین‌و جبایش لەناوچەی هۆراوەکانی باشووری عێراق.

هەندێکیشیان هاوینەهەوارو سەیرانگای هاوینەن‌و، هەوایان فێنك‌و خۆشەو لەگوێ ڕووبار یان لە کەنار دەریان‌و جێگای حەوانەوەو، خزمەتی تری ئامادەیە، وەکو هاوینەهەوارەکان، هاوینەهەواری شەقڵاوەو گەلی عەلی بەگ‌و سەرسەنگ‌و بێخاڵیش لەو جۆرەن، بلاجەکانی ئەسکەندەرییەی میسرو ڤارنای بولگاریا لەو جۆرە شارانەن.

ح- شارە ئاینییەکان:

ئەو شارانە کە لە جێگەیەکی وەهادا دادەمەزرێن کە پێگەیەکی گرنگی هەیە چونکە خەڵکانێك هەن بە چاوێکی پیرۆز سەیری دەکەن وبە ڕۆح وگیان پێوەی بەستراونەتەوە، هەیە جێگەی حەجکردنە وەك مەککەو مەدینە کە موسڵمانان لە هەموو لایەکی جیهانەوە بۆ حەج بۆی دەچن، وە الله ئابادو بنارس لە هیندستان کە بەلای هندۆسەکانەوە پیرۆزە،وەشاری قودس کە بەلای موسڵمان ومەسیحی و یەهودی پیرۆزە، هەشە گۆڕی ئیمامێك یان پیرێکی تێدایە کە شاری مەرقەدی پێ دەڵێن، وەك نەجەف‌و کەربەلاو کازمیە لە عێراق . هەشە کۆمەڵە دێرو کەنیسەیەکی لێیە کە پێی دەڵێن شاری دێرەکان.

### گ- شارە تەندروستەکان :

ئەم جۆرە شارانە خزمەتگوزاری لەشساغیو تەندروستی پێشکەش دەکەن، شاری وەها هەیە ئاوی کانزایی گەراوی تێدا هەیە کە بۆ هەندێ نەخۆش سوودی هەیە. ئەم جۆرە شارەیان قەبارەی بچووکە، وەکو حەمام عەلیل لە عێراقو شاری (فیشی) لە فەرەنسا، شاری واشی هەیە ئاوهەوای سووکە (مصحات)، ئەمانە لە بانە بەرزەکاندا بە بەر خۆرەوە دامەزراونو بای تەرو شێدار نایانگرێتەوەو تەریکو چەپن، رێگای هاتۆچۆشی ئاسانە، شاری داڤوس لە باشووری رۆژهەلاتی سویسرا لەم جۆرە شارانەیە.

### زۆربوون وگەورەبوونی شارەکان

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە شارەکان لەرووی ژمارەو قەبارەیانەوە زۆرگەورەبوونو تا ئێستاش ئەو بارە بەردەوامە، بەهۆی شۆرشی پیشەسازیو پێشکەوتنی هۆکارەکانی هاتوچۆ،بە تایبەتی پێشکەوتنی هێلّی ئاسن بەکارهێنانی شەمەندەفەری خێراو تیژرەو. خەلّکیش ئەوەندە حەزیان بە شارنشینی کردوو روویان لە شاران کرد، سەرەئەنجام لە ماوەی نێوان سالّی ۱۸۰۰ – ۱۹۵۰ شارنشینان ۲٦ جار زیادی کردو بوون بە(۱,٥) ملیار کەس،لەکاتێکدا لەو ماوەیەدا هەموو دانیشتوانی جیهان لە (۲,٦) جار زیاتری نەکردوو بە گشتی لە ۲,٤ ملیار کەس تێ نەپەرین.قەوارەی شارەکانیش پێ بەپێ رووی کرد لە زیادی، دانیشتوانی زۆربەی ئەو شارانە لە سەد هەزارکەس تێ پەری، ئەم خشتەیەی خوارەوەش ئەوەمان نیشان دەدات:

| ساڵ | ژمارەی شارەکان |
|---|---|
| ١٠٨٢ | ٢٠ |
| ١٩٦٠ | ١٤١٣ |
| ١٩٧٣ | ١٧٨٤ |
| ١٩٨٠ | ١٨٥٠ |
| ١٩٨٨ | ١٩٣٠ |
| ١٩٩٤ | ١٩٤٧ |

لە هەمان ئەو ماوەیەدا دانیشتوان لە زۆربەی شارەکاندا دووجارە زیادی کردو لە ملیۆن تێ پەڕی وەکو لەم خشتەیەی داهاتوودا دیارە.

| ساڵ | ژمارەی شارە ملیۆنییەکان |
|---|---|
| ١٨٠٢ | ١ |
| ١٩٠٠ | ٣ |
| ١٩٧٣ | ٧٥ |
| ١٩٨٠ | ١٣٠ |
| ١٩٨٨ | ٢٠٧ |
| ١٩٩٤ | ٢٣١ |

ژمارەی زۆربەی شارە ملیۆن نشینەکانیش ئەوەندە زیادی کرد تا ١٥ شاریان لە (٧) ملیۆن کەس تێپەڕی.




نەخشەی چڕی دانیشتوانی باشوور وباشوری ڕۆژهەڵات وڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئاسیا

ئەو شارە گەورانەش کە دانیشتوانیان لەسەد هەزار کەس زیاترە لە چوار هەرێمدا بڵاون:

**یەکەمیان:** لەوپەڕی ڕۆژهەڵات، واتا لە ڕۆژهەڵاتی دووردا، کە یابانو کۆریاو تایوانو چین دەگرێتەوەو لەکەناراوەوە بە قوڵایی بەرەو ناوەوەی ئاسیا تا ١٦٠٠کم دەکشێت.

**دووەم:** نیمچە کیشوەری هیندستان.

**سێیەم:** ئەوروپا (بە ڕوسیاشەوە)وڕۆژهەڵاتی ناوەراست وباکوری ئەفریقیا.

**چوارەم:** ئەو زەویانەی ئەمریکای باکوور دەگرێتەوە کە کەوتۆتە نێوان بازنەی پانیی (٣٦° و ٤٧°)ی باکوورەوە. لەم هەرێمەش بەدەر، لە نزیك ڕۆخو کەناراوەکان هەندێ شاری گەورە هەنو چەند شارێکیان کەوتونەتە بانە بەرزەکانی مەکسیكو کۆلۆمبیا.

ژمارەی دانیشتوانی جیهان لە ساڵی (١٩٩٥)دا گەیشتە زیاتر لە (٥) ملیار کەس، لەم ژمارەیە ١٧٨٠ ملیۆن کەسیان شارنشین بوون، واتا رێژەی شارنشینان(٤١,١٪) بوو، هەرچی دەوڵەتە پێشکەوتووەکانن کە ژمارەی دانیشتوانیان بە گشتی یەك ملیار کەسە، (٧٠٪)ی ئەم ژمارەیەیان شارنشینن، بە پێچەوانەش، ژمارەی دانیشتوانی وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان کە ٣,٢ ملیار کەسە، ٣٢٪ ی ئەم ژمارەیە شارنشینن.

(سەیرێکی ئەم نەخشەیەش بکە).




نەخشەی چڕی دانیشتوان لەجیهاندا

### كارو فرمانی پایتەختەکان:

پایتەخت لەهەر ولاَتێکدا سەنتەری هەموو کاروفرمانێکی بەڕێوەبردن ورامیاری وقەزائیە،وزۆرجاریش دەبنە سەنتەری رۆشنبیری وهونەر هەروەك لەپایتەختەکانی ولاَتە تازەپێگەیشتوەکاندا دەبینرێت.لەوانەیە پایتەخت بکەوێتە ناوەراستی ولاَت وەك مەدرید و پاریس لەوانەشە بکەوێتە پەراوێز(لاچەپ)ی ولاَت،بەلاَم گرنگ ئەوەیە لەشوێنێکی ئاوەدانی وابێت کە چڕترین ژمارەی دانیشتوانی ولاَتەکەلەخۆبگرێت و پڕجموجۆلَترین هاتوچۆوگواستنەوەی بەسەرەوەبێت وزۆرترین چالاکی ئابووریشی تێدابێت،هەروەك لە واشنتۆن و کانبێرا بەرچاودەکەون.

پایتەخت بە یەکێ لەم دوو رێگایە دادەمەزرێ :

١. گەشەکردنێکی سروشتی شارێکی گەورە کەچەندین کاروفرمانی جۆراوجۆر لەخۆبگرێت کە مێژوویەکی دێرینی هەبێ وچالاکیەکی زیندووی ئابووریشی تێدابێ وەك قاهیرەودیمەشق.

٢. یان شارێکی بچووکە ودەکرێتە پایتەخت یانیش شارێکی تازە بنیاد نراوە ودەکرێت بە پایتەخت وەك بەرازیلیا پایتەختی بەرازیل.

پایتەختە گەورەکانی جیهان وەك لەندەن وپاریس و تۆکیۆو مۆسکۆ چەندین کاروفرمانی جۆریەجۆر و ئالۆز وتێکهەلَکێش(بەیەکەوە بەستراو)یان تێدایە،وەك بەڕێوەبردن وحوکم کردن ومامەلَەداراییەکان وبازرگانی وپیشەسازی وڕۆشنبیری،لەگەلَ بەرزی رێژەی ئەو کەسانەی کەلە کاروبارەکانی میری وبازرگانی وهاتوچۆوگواستنەوەو تاقتکردن(خەزن کردن)وئیش وکاری بازاڕ وکاروباری دارایی کە ٤٠ — ٤٥ ٪ ی سەرجەمی کارکەران پێك دێنن.

## دیاردەی بیابان نشینی و نیشتەجێ گردنی (بەدو – کۆچەر):

بیابان نشینی: زاراوەیەکە جۆرە ژیانێکی کۆمەلآیەتی و ئابووری و کۆمەڵـە خەڵکانێك دەگرێتەوە(کە پێیان دەوترێت بەدو) کە هەمیشـە لـە بیابانەکانـدا خەریکی کۆچـڕەون ونیشـتەجێ نـین، چـونکە چـاوگەی ژیانیـان لـە ناوچـەی بیابـان ونیمچـەبیاباندا بریتیـە لـە بـەخێوکردنی حوشـتر ومـەڕ کـە بـەهۆی هەلومەرجی ئاووهەواوە ناچار ئەودالّی ئاو و لەوەڕن.بـەدوەکان بـە شـێوەی کۆمەڵی سەرەتایی، لاچەپ وتەریك لە دەوار(ڕەشماڵ)دا دەژیـن کەلـە مـووی بزن دروستی دەکەن. هەندێکیان لە دەوروبەری بیرەئاوەکان یـان مێرگـەکان بـە شـێوەی کۆمـەڵ کۆمـەڵی لێـك دانـەبڕاو، یـان کۆمـەڵی جیاجیـا دەژیـن و نیشتەجێن و ئۆقرەیان گرتووە،ئەمانە خـاو خێـزانن، ئەوانـەش کـە شـوانن و سەرپەرشتی لەوەڕاندنی ئاژەڵ دەکەن، ناچار بەدووی لەوەڕدا دەگەڕێن.

دیاردەیەکی تری کۆچڕەوی وەکو هینەکەی ئـەمان لـە تـیرەو خێڵـە کوردەکـانی نـاو چـیاکانی کوردسـتان هەیـە(کـەپێیان دەوتـرێ ڕەوەنـد یـان کۆچەر)ئـەمانیش بـە هاوینـان کـە بـەفری چیاکان دەتوێتـەوە و گـژوگیا لـە کوێستانەکاندا دەبوژێتەوە، پادەشتە گەرم و ووشکەکان جـێ دێڵـن و بـەرەو کوێسـتانان مـەڕوماڵاتی خۆیـان دەبـەن،بۆ زسـتانیش دووبـارە کۆچـڕەویان سەربەرەوخوار روودەکاتەوە دۆڵ و پادەشتەکان کـە گـەرمتر و بەلـەوەڕترن، بەم جۆرە کۆچڕەوەش دەووترێـت: (کۆچـڕەوی سـتوونی وەرزەکـان) ، واتـا (گەرمیان و کوێستانکردن) .جا بەدو یان ڕەوەند وکۆچەر، سەر بەهەر گەلێك بن، ئەگەر هەر لەو دۆخە کۆمەلآیەتی و ئابووری و تەندروسـتی و رۆشـنبیریە دواکەوتوونـەدا بمێننـەوەو پشـت گـوێ بخـرێن ئـەوا نـاتوانن هاوبەشـیەکی چـالاکانە لـە خزمـەتکردنی نیشـتمانەکەی خۆیانـدا بکـەن و هـەر لـە دواوە

دەمێننــەوە.لەبەرئــەوە زۆر دەوڵــەت پرۆژەیــان بــۆ نیشــتەجێ کردنــی خێڵــە کۆچــەرەکانی خۆیــان کــردووە هــەروەك نیشــتەجێکردنی ژمارەیــەکی زۆری خێڵەکانی قەرغیز و قۆزاق و تورکمان لە ناوچەکانی تورکستان لە ناوەراستی ئاســیا لــە ســەردەمی یــەکێتی ســۆڤیەتی پێشــوو کــە پاشــان بــە کــاری کشتوکاڵەوە خەریك بوون.هــەروەها پــرۆژەی هەڵمەنــد لــە ئەفغانســتان کەبــە پرۆژەیـــەکی ســــەرکەوتووی نیشــــتەجێکردنی کۆچــــەرەکانی ناوچــــەکە دادەنرێت.لە عێراقیش ساڵی ١٩٥١ پرۆژەی نیشتەجێکردنی خێڵــەکانی بــەدو دەســتی پێکــرد کــاتێ خێڵەعەرەبــەکانی (شــەممەر و دلــێم و...هتــد) لــە ناوچــەکانی نێــوان (شــەنگال و حــەزەر)یــا ئــاوەدان کــردەوەو لەســاڵی ١٩٦٥ ژمارەی گوندەکانی ئاوەدانیان کرەوە گەیشتە ٤٠٠ گوند،حکومەتی عێراقیش پێش ئــەوە لەســاڵی ١٩٦٠ گونــدی (رەبیعــە)ی دامەزرانــد کــە دواتــر بــوو بــە ناحیە،هەرخێزانێکیش ١٥٠ دۆنم زەوی پێدا بۆ ئەوەی بیکــا بەکشــتوکاڵ،ئەم کارەشی بۆ تەعریبکردنی ئەو ناوچە کوردستانیە بوو.

# بەشی نۆیەم

## ژینگەکان

### پێناسینی ژینگە:

ژینگە ئەو دەوروبەرەیە کە مرۆڤ وگیانلەبەران دەگرێتەخۆی، شوێنەواری کارلێکردنی مرۆڤ لەدەوروبەرەکەی بە شێوەیەکی بەردەوام لەوەدا دەردەکەوێ کە ئەوگۆڕانکاریانەی بەسەر دەوروبەرەکەی دادێت چ کاریگەریەك جێ دێڵێ لەسەر سروشتی ژیانی شارستانێتی و عەقڵی مرۆڤ، سوود وەرگرتنیش لە پێکهاتەکانی ئەو دەوروبەرە دەوەستێتە سەر توانای مرۆڤ کە ئایا تا چەند دەتوانێ دەست بکا بە وەبەرهێنانی ڕەگەزەکانی ئەو دەوروبەرە و چۆن دەتوانێ سوود لەو دەوروبەرە وەربگرێت بۆ ژیان وخۆشگوزەرانی خۆی.

ئەو زەوییەی کە مرۆڤ لەسەری دەژی و ئەو بەرگە غاز و ئاو و ڕەقەی کە دەوری زەوییەکەیان داوە بریتین لە رەگەزەکانی دەوروبەر و دەتوانین ئەو پێکهێنەرانە ناوبنێین بە(ژینگەی سروشتی)، وکارلێکردنی مرۆڤ و ژینگە سروشتیەکەی وا دەکات جۆرە پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕکێ لە نێوانیان دروست بێت.هەروەك (زمرمان) دەڵێت: (سەرچاوەکانی سامان لە خۆیەوە نابێت،بەلکو لە ئەنجامی کارلێکردنی نێوان مرۆڤ و رەگەزەکانی ئەو ژینگەیەوە پێکدێت کەلەناویدا دەژی، ئەوەتا بەروبوومی کشتوکاڵ ئەنجامی کارلێکردنی نێوان مرۆڤ و رەگەزەکانی خاکە لەیەکتری،کانی نەوت و خەڵووزیش تا مرۆڤ نەیاندۆزێتەوە نابن بە سامان).

کەواتە مرۆڤ ڕەگەزی سەرەکی ژینگەیە،سەرەڕای کارلێککردنی مرۆڤ و ژینگە لەیەکتری کەچی ڕەگەزەکانی ژینگەش لە گۆڕانێکی هەمیشەوبەردەوام دان وبەشێوەیەکە کە لە گوێرەی تەمەنی مرۆڤ، هەستی پێناکرێت، بۆنمونە کردای داڕووتان و داتاشینی چیا و بەرزاییەکان و پڕبوونەوەی دۆڵەکان و کۆبوونەوەی نیشتەنی و پەیدابوونی دەلتاکان و جوڵەی تەپۆلکە لمینەکان لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر و ووردبوونی تاوێرەکان و داتاشران و کشانەوەی کەناراوەکان ئەمانە هەمووی بەڵگەی ئەو ڕاستییەن. گۆڕانکاری وەهاش هەیە کە لە پڕوخێرا ڕوودەدەن وەك بوومەلەرزەو تەقینەوەی کانیە ئاگرینەکان وئەو گۆرانکارییانەی کە بەسەر ڕووی زەویدا دێنن.بۆیە ئەو گۆڕانکاریانەی کەلە سروشت دا ڕوودەدەن هەبێ و نەبێ لە چوارچێوەی چەند ڕژێم و یاسایەکدا ڕوودەدەن کە پەیوەندی نێوان ئەو ڕەگەزانە لەو ژینگە سروشتیەدا دەستنیشان دەکات.

## جۆرەکانی ژینگە:

ژینگە بە چوارچێوەو ناوەندێك دانراوە کە مرۆڤ هەموو چالاکیەکی زانستیانە وجموجۆڵێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری خۆی لە ناودا دەکات بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی خۆی دابین بکات و خۆشی بەردەوام بێت لە مانەوە(البقاء). بلاوبونەوەو تەشەنەکردنی مرۆڤ لە ڕووبەرە بەرفراوانەکانی سەر زەمین ئەوەمان بۆ دەردەخات کە هەموو کۆشش و چالاکیەکی جۆراوجۆری مرۆڤ مۆرکی هەلومەرج و دۆخەکانی ئەو ژینگە سروشتیەی هەلگرتووە کە پێکهێنەرەکانیشی لە هەموو قۆلێکی ئەم سەر زەمینەدا لەوانەیە لەیەك نەچن. لەسەر ئەم بنچینەیە ڕووەکی زۆروجۆراو جۆر

دەبینین، وەکو رووەکی خۆرسك کە خۆی لە ژینگەی دارستانەکان و و ژینگەی بیابانەکان دەبینێتەوە. رووەکی واش هەیە پەیوەندی بە پیشەوە هەیە وەکو ژینگەی لەوەڕگاکان و ژینگەی کشتوکاڵ و ژینگەی پیشەسازی لێرەشدا تەنها رووەکی خۆرسك راڤە دەکەین کە ئەمانەیە:

١. ژینگەی دارستان.　　　　２. ژینگەی بیابانەکان.

### ژینگەی دارستان:

ئەو پارچە زەوییە پڕ لە ڕووەکە دارودرەختانەیە کە داری بەرزوبڵندی ئەوتۆی تێدایە کەلێنیان لە نێواندا نەماوەو لقەکانیان لەسەرەوە تێکئالاون. ئەم دارستانانە نەك هەر لە بوارێکدا بگرە لە بوارێك زیاتردا لێك ناچن، دارستان هەیە گەڵاکەی ناوەرێت، یان بەرەبەرە گەڵاکانی دەوەرن پێیان دەڵێن (دارستانی هەمیشە سەوز) دارستانیش هەیە گەڵاکانی بە یەکجار دەوەرێت وپێی دەڵێن (دارستانی گەڵارێژ یان خەزانی). جگە لەو جیاوازیە سروشتی گەڵای دارێك لە دارێکی تر ناچێت، دار هەیە گەڵاکەی دەرزیلەییە، هەشە گەڵاکەی گەورەو پانە. سروشتی تەختەکانیش کە دارەکانیان لێ پێك دێت دیسان جیاوازن،دار هەیە تەختەکەی نەرمەو هەیە تەختەکەی ڕەقە وهەریەکەیان لە بوارێکی پیشەسازی دا بەکاردەهێنرێت.

لە بابەت دارستانەکانەوە تەنها ئەمانەی خوارەوە باس دەکەین:

١- دارستانە باران زۆرەکانی کەمەرەی زەمین.

٢- دارستانە ساردەکان (قوچەکیەکان).

## ١- دارستانه باران زۆرەكانی كەمەرەی زەمین:

دارســتانەكانی كەمــەرەی زەمــین رووبــەرێكی بــەرفراوانی هەرێمــە گەرمەكانیان داپۆشیوە كە حەوزی رووباری ئەمەزۆن لە ئەمــەریكای باشـوور ودەشــتە نزمــەكانی ئــەمریكای ناوەراســت و حــەوزی رووبــاری كۆنگــۆ لــە ئەفــەریقیا وكــەنارەكانی مالابــار لــە هیندســتان دەگرێتــەوە.تێكــرای گــەرمی مانگانەش لەو ناوچانەدا لە نێوان (٧٥° و ٨٠°)ی فەهرەنهایتدایە و بارانیشی بە درێژایی سالْ لیْ دەبارێت كە تێكرای سـالانەی ٢٠٠ سـانتیمەترەو بـە سـەر مانگەكانی سالْدا دابەشكراوە.

بۆیە ئەو هەرێمانە بـە درێـژایی سـالْ دەرفـەتی ووشـكیان بـۆ نارەخسـێت، بەرزی پلەی گەرمی و رێژەی بەرزی شـیْ بوونەتـە هـۆی پـەیدابوون و گەشـە كردنی داری چرو‌پڕی بەرزوبلْندی لەسەرەوە تێكئالاو بە جـۆرێكی ئـەوتۆ كـە رێگا بە تیشكی خۆر نـادەن بگاتـە زەوی دارسـتانەكان، ئەمـەش بۆتـە هـۆی تاریكبوونی ناوەوەی ئەو دارستانانە.

سەرەرای ئەوانەش هەواكەی ناویشی كپەو گەلیْ مێروو جرو جانەوەریش اە ناو دارستانەكاندا بلاو بوونەتەوە، لە لایـەكی تریشـەوە ئاوەرۆیـەكی زۆریـش بەسەر زەوی ئەو دارستانانەدا دەڕوات، كە لەوانەیە گیانلەبەری دارسـتانەكە وەكو بالْندە و خشۆك بە تایبەتیش مار دەچـنە ناویانـەوە. لەبەرئـەوەی كـە دۆخی هەوای دارستانەكانی كەمەرەی زەمین گەرم وشێدارو خنكێنەرە بۆیـە دانیشـتوانی كەمـەو ئـەو كەمـەش بـریتین لەهەنـدیْ كۆمـەلْی سـاكارو سەرەتایی كەلەگەلْ هەلومەرجی ئەو ژینگەیەدا گونجاون، چونكە ئادەمیزادی سـەرەتایی ئـەو ناوچـانە لەهـەموو خـەلْكێك زیـاتر هـۆگری ئـەو ژینگەیـەی خۆیان بـوون و دەتـوانن لـەو دۆخـە سروشـتیە سـەختەدا گوزەران بكـەن،

ڕێژەی ئەم کۆمەڵە سەرەتاییانە لەسەرەتای سەدەی پانزەهەمدا تەنیا ١٠٪ ی هەموو دانیشتوانی جیهان بوون، واتا نزیکەی(٢٧,٥) ملیۆن کەس دەبوون. بەڵام چەند هۆکارێك بوونە هۆی فەوتان ولەناوچوونی ئەم کۆمەڵە سەرەتاییانە، ،وەك کوشتن وجینۆسایدکردنیان بە دەستی مرۆڤە سپی پێستەکان ، و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کوشندە لە ناویاندا بە جۆرێکی وەها ئێستا تەنیا چەند هەزار کەسێکیان ماوەتەوە کە لەوەوبەر ملیۆنەها بوون، ئەو کۆمەڵانەشیان کە زۆرتر لە نەمانەوە نزیکن کۆمەڵانی دارستانە کەمەرەبییەکانن، ئەوانیش کورتەباڵاکان و قولەرەشەکانن. دەشکرێت لەمەڕ دوو کۆمەڵ لەو کۆمەڵانە شارەزایی پەیدا بکەین و باسیان بکەین:

١. کۆمەڵەی کۆکردنەوەو چنینەوە.

٢. کۆمەڵەی کشتوکاڵی سەرتایی جێ گۆڕ.

### ١. کۆمەڵەی کۆکردنەوەو چنینەوە:

چەند کۆمەڵەیەك هەن ژیانیان لەسەر کۆکردنەوەو چنینەوەی میوەو ڕەگ وبەری درەختەکانە،زۆر کەمیش ڕوودەدات کە کشتوکاڵ بکەن یان گیانلەبەر بەخێو بکەن. کۆمەڵەی بۆشمەن و هۆتنتۆت (لە ئەفەریقیا) و کۆمەڵەی سیمانگ Semang و سکای(لەنیمچە دورگەی مەلایۆ) باشترین نموونەی کۆمەڵەکانی کۆکردنەوەو چنینەوەن.

## سیمانگ و سکای :

سیمانگ لـه کۆمەڵـەی مرۆڤـە کورتـە باڵاکـانن کـە بـاڵای پیاوەکانیـان لـە ١٥٠ سـم زیاترنییـە وبـاڵای ژنەکانیشـیان لـەوە کەمترە،پێسـتیان ڕەشـە و موویـان کەمـە.بـەڵام سـکای لـەوان درێـژتر بـاریکترن وپیستیشـیان کـەمتر ڕەشـە وزیـاتریش بـە مـوو ن.ژمارەیـان لەئێسـتادا کەمەولەچـەند هـەزارێك تێناپـەڕێت بەشـێوەی کۆمـەڵ کۆمـەڵی بچـووك دەژیـن کـە هەرکۆمـەڵێکیان ڕووبـەرێکی دیـاریکراوی زەوی هەیـە کەتێیـدا دەسـوڕێتەوە و لـە ٥٠ کـم چوارگۆشـە تێناپەڕێت،بەدەگمـەنیش کۆمـەڵێك سـنووری زەویەکـەی خـۆی دەبـەزێنێت بـۆ سـەر زەوی هاوسـێکەی ئەگـەر ئـەوەش ڕوویـدا ئـەوا بۆکۆکردنـەوەی ڕەگـی ڕووەکـە لـە زەوی هاوسـێکەی.سـیمانگ وسـکای ڕۆژانـە دوو ژەم خـۆراك دەخـۆن کـە بـەیانیان وئێوارانـە، زۆربـەی خواردنیشـیان بریتیـە لـە جۆرەنانێك کـە خۆیـان لـە ڕەگـی ڕووەك ودانەوێڵـەی خۆرسـك(سروشـتی) دروسـتی دەکەن،هەنـدێ جـاریش بـرنج لێ دەنـێن کەبـە شـێوەی ئـاڵوگۆڕ دەسـتیان دەکـەوێ.کەواتـە زۆربـەی خواردنیـان لـەڕووەکی خۆرسـك دەسـت دەکـەوێ،جا لەبەرئـەوەی ئـەم جـۆرە ڕووەکانـەش بەوشـێوە پێویسـتە نییـە بۆیـە لـە گـەڕان و سوڕان دا دەبـن بۆکۆکردنـەوەی ئـەو بـڕەی کـە ئـەو کۆمەڵانـە پێویسـتیان پێیـەتی لـە ڕەگـی ڕووەك وبـەری وەك (سەلکی یام و دوریان و مانجۆ...).

### خانوو و بەرگ و چەك:

سكای لەخانووی كوخ كەشێوەی لاكێشەیە دەژین ودیوارەكەی لە لق وپۆپی دارخورما یان داری تر ،بنمیچەكەی لە گەڵای چنراوی خورما(پووشە خورما) دروستكراوە،ئەم خانووانە هەندێكیان درێژیان بیست پێیەو یەك مەتریش لەزەویەوە بەرزن دوورر لەتەڕی وگیانلەبەران،بەڵام خانووە زۆر بچوكەكان وەك هێلانە بەسەر لق وپۆپی دارە بەرزوگەورەكاندا دروست دەكرێن.

بەڵام سیمانك خانووەكانیان كوخ وشێوە لاكێشەیی نییە بەڵكو بریتیە لە داڵدەیەك لە كەلە لق وپۆپی دارەكان دروستكراوە وبەیەكەوە بەستراون كە چەند خێزانێك لە خۆدەگرێ.

بەرگیشیان بریتیە لە گەڵای داروپیشووی چنراوی داری (بوبا) كە جاروبار وەك كڵاو لەسەریشی دەكەن.چەكی سیمانگ بریتیە لە(كەوان) كە لە لق وپۆپی دار و(ژێ) كەلە دەماری گیانلەبەران یان لە ریشاڵی رووەك (تیر) كەلە داری حەیزەران دروستی دەكەن.بەڵام چەكی سكای بریتیە لە تفەنگی فوو كە لوولە قامیشێكە بە زەبری فووپیاكردن چەند تیرێكی لێوە دەردەپەرێت و بۆ ڕاوكردنی باڵندەو مشك وخشۆكەكان بەكاردەهێنرێت.

### ٢. كۆمەڵەی كشتوكاڵی سەرەتایی جێ گۆڕ :

گەلی (بۆرۆ) لە ئەمەریكای باشوور گەلێكی سەرەتاییەو بە كشتوكاڵی جێ گۆڕەوە خەریكن، ئەوكشتوكاڵەش لەدارستانە باراناویەكانی كەمەرەیی ئەنجام دەدرێت بەتایبەتی لەو دارستانانەی كەكەوتوونەتە شوێنی بەیەكگەیشتنی هەردوو لقی (جابوراو واسا) ی رووباری ئەمازۆن . بۆرۆ

لەهیندیە سورەکانی ئەمەریکای باشوورن و بەشێوەی کۆمەڵی بچووك بچووك دەژین لە دەوروبەری پەنجا گوند کە بەهەموویان چەند هەزار کەسێك دەبن. پێستییان ڕەنگ برۆنزی مەیلەو زەردێکی ڕەشباوو سوورکارە.قژی سەریشیان ڕەش و زبر و تاڵ تاڵی ڕاست وڕێکە،سەر خڕ ولووت پانن کەچی لچ ولێویان ئەستوور نییە،بالآیان مامناوەندە کەلە پیاوان دەگاتە ١٦٠ سم بەڵام لە ژنان کەمترە.گەلی بۆرۆ کاروباریان لە نێوئەندامانی خێزاندا دابەش کردووە چونکە کاروبارانەی هێزی زۆری پێویستە پیاوان پێی هەڵدەستن وەك پاککردنەوەی زەوی لە داروەوەن بۆئەوەی بۆ کشتوکاڵ ئامادەی بکەن،هەروەها دروستکردنی خانوو و ڕاوکردن وشەڕکردن و دروستکدنی چەك وبەلەم،بەڵام ژنان هەڵدەستن بە بەخێوکردنی منداڵ وخۆراك ئامادەکردن ، خۆراکیشیان بریتیە لە مایۆنیق ومشك وبۆق ومارمێلکەومارو هەنگوینی سروشتی، زۆرجاریش لەبەرئەوەی خۆراکیان کەم خویێ یە بۆیە خۆڵەمێشی ئاگرەکە دەخۆن،نانیش لە (کاسافا) دروست دەکەن.گوندەکانیشیان بچووکن و ژمارەی دانیشتوانی هەر گوندێکیش لە ٥٠ — ٢٠٠ کەس دەبێت.بۆرۆ لە هەموو گەلێك زیاتر بڕوایان بە فریشتەو ئەفسانە هەیە و لەهەموو گەلێکیش زیاتر منداڵی خۆیان خۆش دەوێت،کەچی لەنەریتیان ئەوەیەکە خواردنی گۆشت لەمنداڵ حەرام دەکەن تا ئەو منداڵە پیێ دەگات و تەواو گەورەدەبێت.

## ژیانی ئابووری

کۆڵەگەی ژیانی بۆرۆ کشتوکاڵە،لەهەندێ دۆخی تەنگانەشدا ڕاودەکەن و خۆراك کۆدەکەنەوە،لەبەرئەوەی ئامادەکردنی زەوی بۆ کشتوکاڵ کارێکی دژوارە و هێزوبازووی دەوێ بۆیە پیاوان ئەم کارە دەکەن،کە بە تەوری بەردین زەویەکە لە داروددەوەن پاك دەکەنەوە ئینجا کۆی دەکەنەوەو ئاگری تێ بەردەدەن وخۆڵەمێشەکەش بەسەر زەویەکەدا پەرت دەکەن،بەلاّم زۆری پێ ناچێت دارەکان شین دەبنەوە لەو زەویانەی کە دارەکانی لێ بڕابۆوە،ئەمەش مانای وایە ئەو زەویەی بۆ کشتوکاڵ ئامادە دەکرێ تەنها بۆ ماوەی دوو وەرز یان سێ وەرز دەتوانرێ وەبەربهێنرێ دوای ئەوە ئیتر زەویەکە ئەو پێزوبرشتەی نامێنێت کە ئەمەش ناچاریان دەکات بۆ پارچە زەویەکی تر بگوازنەوە،باشترین بەروبومی گەلی بۆرۆ بریتیە لە مایۆنیق چونکە لە گەڵ تۆوی کاسافا بە خۆراکی سەرەکیان دادەنرێت،جگە لە مایۆنیق بەروبومی دیکەش دەچێنن وەك یام و پەتاتەو کولەکەو بیبەرو پاقلە، زۆر بەکەمیش گەنمەشامی وکۆکا. بۆرۆ لە ڕاوکردنی گیانلەبەرە گەورەکاندا بلیمەتن چونکە بە وردی شوێن پێیان هەڵدەگرن و شارەزای جوڵەوجموجۆڵیانن.

بۆرۆ لە جێگا والاّ وڕووتەنەکانی ناو دارستانەکان دەژین ،ولەناو یەك خانووشدا ژمارەیەکی زۆر پێکەوە دەژین کە ژمارەیان دەگاتە ٥٠ کەس وهەندێ جاریش دەگاتە ٢٠٠ کەس،خانووەکانیشیان بێ پەنجەرەن بۆیە شەووڕۆژ تاریکن ئەمەش لە بەلاّی مێش ومەگەز دەیانپارێزێت.بەرگ وپۆشاکیشیان لەهی دانیشتوانی ناوچە گەرم وشێدارەکانی کەمەرەی زەمین جیاواز نییە، بۆ گواستنەوەو هاتوچۆش بەلەم بەکاردێنن چونکە ئاوەڕۆی

زۆر لەناوچـەکەدا هەیە،ئـەم بەلەمانـەش مـوڵکی کـەس نییـە بەتـەنها بـەڵکو موڵکی هـەموو لایەکـە لەڕووبارەکانیشـدا لـە جێگـای دوور لـە چـاوی دوژمـن دادەنرێن.گـەلی بـۆرۆ ژمارەیـان بـەرەو کەمبونـەوە دەچـێت بـەهۆی ئـەوەی بازرگانـانی لاسـتیك زۆریـان لێ دەکـوژن و تووشـی نەخۆشـیەکی زۆریـش دەبنەوە،لەوانەشە ڕۆژێك دابێت کەبەتەواوی توشی قڕبوون بێن.

## ٣- دارستانە سنەوبەریەکان(قوچەکیەکان):

دارستانە سنەوبەریەکان(قوچەکیەکان) بازنە پانیە مامناوەندە ساردەکەی نیوە گۆی باکووری زەوی داپۆشیوە کە چەند بەشێکی فراوانـی ئەمـەریکای بـاکوور و ئۆراسـیا دەگرێتـەوە، واتـا بازنـەی پـانیی ٥٠° لـە ئۆراسـیا٤٥° لـە ئەمـــەریکا. ســـنووری باکووریشـــی لەگـــەڵ هێڵـــی گـــەرمی ١٠° س دەڕوات لەگـەرمترینی مانگـەکانی سـاڵدا ،کەواتـە ناوچـەیەکی پێگـوازە (انتقالیـة) لـە نێـوان دارسـتانە گـەلارێزەکانی باشـور وبیابانـە سـەهۆڵبەندانەکەی بـاکور، چـونکە نـزم بوونـەوەی پلـەی گـەرمی تـا خـوارتر لـە ١٠° س لـە زۆربـەی مانگەکانی ساڵدا ئەوە دەگەیەنێت کە قەبارە و چڕی دارەکان کەم دەبنەوەو ئـیتر لـەو پلـە گەرمییەیـدا نـاڕوێن و گەشـە ناکـەن. داری کـاژ (سـنەوبەر) قوچەکیەو قەدەکەی ڕاستە و گەلاکانی دەرزیلەییەو لەماوەی ساڵدا نـاوەرن، واتا دارێکی هەمیشە سەوزن پێویستیشی بـە نزیکـەی٢٥٠ ملـم بـاران هەیـە و دەشتوانێت لە خاکی بێ پێزدا بژیت. دارسـتانەکانی کـاژ گـەورەترین کۆگـای تەختەی نەرمن لە جیهاندا و دارەکانیشی بریتیە لە کاژ و مێشـە (شـەربین) و شەوکەران. ئەم دارستانانە رووبەرێکی بەرفراوانی لە ولاتانی سـوید و نـەرویج و فینلەندە داپۆشیوەو (سیبیریا)ش فراوانترین ناوچەیە لـە جیهانـدا کـە ئـەم

جۆره دارستانەی تێدا بڵاوبووبێتەوه، کەچی ئەو سوودەی لێ نەبینرا ، بەتایبەتی لە سیبیریا، بەهۆی ئەوەی ئاووهەوای ناوچەکە گەلێ ساردوسەختە و،ئەو رووبارانەش کە لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەڕۆن ڕێژگەکانیان دەیبەستێ. هەروەها لە نێوان (زەریای ئەتلەسی) و (زەریای هێمن)یشدا ناوچەیەکی بەرفراوانی کاژ کشاوەو دارستانێکی لێك نەپچراوی لە نێوان ناوچەی باکوری ئەمەریکا و بەشەکانی باکوری کەنەدا دا پێکهێناوە.



دارستانی سنەوبەری

هەرچی لە نیوەی باشوری گۆی زەویە ئەوا ئەو جۆرە دارستانە بە شێوەی پارچەی بچووك تەنیا لە خۆرئاواو باشوری ئەمەریکای باشووردا دەبینرێن، چونکە ووشکانی لەوێ کەمە . پیشەی دانیشتوانی ئەم دارستانانەش بریتیە لە دار برین وڕاوی گیانلەبەری کەوڵداری وەکو (ڕێوی و کەروێشك) ، هەروەها کشتوکاڵی جۆ و گارس(شۆفان) و گەنمیش دەکەن جگە لەوەش هەندێ پیشەسازی یان هەیە کە لە کەرستەی خاوی تەختە سازدەکرێت، وەك دروستکردنی کاغەزو دەنکەشخارتە.

## ژینگەی بیابانەکان:

ناڵەباری وسەختی ئاووهەوا لەو هەرێمانەدا کە ژینگەی بیابانی پێ دەڵێن شوێنەوارێکی نەرێنی تێدا بەجێ هێشتووه. دەشتوانین بیابانەکان بە دوو جۆر بیابان دابنێین: بیابانە گەرمەکان و بیابانە ساردەکان. هەرچی بیابانە گەرمەکانە، لە نێوان پلەکانی گەرمی رۆژێکی دا (٢٤) سەعات جیاوازیەکی گەورە هەیە ، هەروەهاش لە نێوان پلەی گەرمی ی ساڵدا، واتا دوو هەوایە، بارانیش دەگمەنەو رووەك وگیانلەبەریش کەمە.ئەم دۆخەش باروشێوازی ژیانی ئەو کۆمەڵە ئادەمیزادانەمان بۆ روون دەکەنەوە کە لەوێ دەژین. ئەو کۆمەلانە یان شوانن لە چوارچێوەی ئەو ناوچانەدا بە پیشەی شوانییەوە خەریکن کە رووبارو چاوگەی ئاوی تێدا نییە، یان جوتیارن ولە نزیك رووبارو لەو مێرگانەدا بە کشتوکاڵەوە خەریکن کە کانیاو یان بیری ئاوی تێدایە، وەکو مێرگەکانی بیابانی گەورە،لەو مێرگانەدا جۆ و گەنمە شامی و زەیتون و دارمێو و دار خورما وەبەردێنن. هەرچی بیابانە ساردەکانیشە ژیانێکی هەژاریی شوانیی تێدا هەیە کە چەند کۆمەڵێك پێوەی خەریکن(ئەسکیمۆ) یان پێ دەڵێن.ژمارەی ئەسکیمۆش نزیکەی (٤٠) هەزار کەسێك دەبن، لەمانە نزیکەی (١٦) هەزاریان لە کەنەدا و (١٤) هەزاریان لە گرینلاند و ئەویتری لە ئالاسکا و کەنارەکانی بەری ئاسیای گەرووی بێرینگ دەژین. هەموشیان بە زمانێك دەدوێن و چەند دیالێکتێکی لێك نزیکیشان هەیە. باڵایان کورتە، وکەللەیان درێژە، ولووتیان رێك و بچووکەو قژیشیان رەش و زبرە. ئەسکیمۆ بە شێوەی کۆمەڵەی

بچـووك بچـووك دەژيــن و هــەر كۆمەلــەش ٤٠٠ — ٥٠٠ كــەس دەبــن بــە تايبــەتيش بــە زســتانان، بــەلاّم هاوينــان كــەم دەبنــەوە. ئەســكيمۆ شوانيشــن، ئاسـكی(ڕەنــە) دەلــەوەڕێنن بــەلاّم ئــەو كۆمەلاّنــەيان كـە لــە كەناراوەكانەوە نزيكن ڕاوی دەريايی دەكەن.




ژينگەی بيابانە ساردەكان(تەندرا)

## پیس بوونی ژینگە:

مرۆڤ بەو ناوچەیەوە پابەندە کە ئیش و کاری تێدا دەکات. ئەو ناوچەیەش بە بنچینەی شارستانیی و بناغەی عەقل وهۆشی دادەنرێت، لەبەر ئەوە دەبێت نیشانەو جیاکەرەوەکانی ئەو پابەندیە ئەرێنی ونەرێنیان بخوێنرێن ولێیان بکۆلرێتەوە، چونکە ژیانی مرۆڤ و بەردەوامی ژیانی مرۆڤ لەسەر خستنەژێر بارو وەبەرهێنانی ئەو رەگەزانە بەندە کە ژینگەکەی لێ پێکهاتووە و تا چ رادەیەك دەتوانێت پێداویستی سەرەکی خۆی لێ دەست بکەوێت و هەموو پێداویستیەکی مانەوەو بەردەوامی و گەشەکردن و وەچەخستنەوەی تێدا دابین بکات و هۆی حەسانەوەی و هەوا گۆرینی (استجمام) بۆ ئامادە ببێت. هەر زیانێکیش تووشی ئەو رەگەزانە ببێت بێگومان کارێکی نەرێنی بەکاروانی بەردەوامی ژیانی کۆمەلی ئادەمیزاد دەگەیەنێت وئەمرۆ بێت یان سبەی زیان لەچالاکیەکانیشی دەدات، چونکە مرۆڤ خۆی کارتێکەرێکی زیندەوانیە لەو دەزگا ژینگەکردە زیندووەدا ، ساغی و سەلامەتی پێکهێرەکانی ژینگەی دەوروبەریەوە بەندە.

ئەو پێشکەوتنە زانستانەو تەکنەلۆجیانەش کە لەم ماوەیەی دواییەدا جیهانی گرتۆتەوە شوێنەواری بە شێوەیەکی روون وئاشکرا گەیشتۆتە بوارەکانی پیشەسازی و کشتوکالیش، وچەند گیروگرفتێکی بنچینەییشی لەگەلٚ خۆی هێناوە کە رەگەزەکانی ژینگە ئێستا پێوەی دەنالێنن، ئەو گیروگرفتانە کاتێك دەرکەوتن و ئاشکرا بوون کە چالاکیی زانستی و تەکنەلۆجی هەموو بوارێکی جۆربەجۆری ژیانی گرتەوە بە جۆریکی ئەوتۆ کە ئەم گیروگرفتانە سیستەمی ژینگەیی ئێستای لاسەنگ کردووە لەوانەشە مەترسیەکی گەورەتر بۆ ئادەمیزاد دروست بکات. کرداری دەرچوون

ولادانیش لە سیستەمی ژینگەیی پێی دەوترێت ( بوارەکانی پیسبوونی ڕەگەزەکانی ژینگە).

گرنگترین پێکهێنەرەکانی ژینگەش کە لەوانەیە تووشی مەترسی پیسبوون ببن ئەمانن:

١. پیسبوونی پێکهێنەرەکانی هەوا.

٢. پیسبووونی ئاو.

٣. پیسبووونی خاك.

١. پیسبوونی پێکهێنەرەکانی هەوا:

دیاردەی پیسبوون دیاردەیەکی ئەوەندە کۆنە کە ڕەگوڕیشەی لەگەڵ پەیدابوونی خودی سرووشتدا داکوتاوە، چونکەهەر لە کۆنەوە کانە ئاگرینەکان و ڕەشەبای بەهێز ببوونە هۆی پیسکردنی ژینگە، بەلآم دوای شۆرشی پیشەسازی و خڕبوونەوەی کارگەکان لە نزیك شارەکان و ناوەراستی نشینەگەکانی مرۆڤەوە، ئیتر ئەوماددانەی کەدەبنە هۆی پیسبوونی هەوا وپێکهێنەرەکانی پتر بوون، ئەویش بە هۆی ئەو غازە ژەهراوی و دووکەڵ و بۆنە پیسانەی کەلە کارگەکانەوە دەردەچن. ئەمانە بوون بە هۆی لاسەنگ بوونی ڕێژە سروشتیەکەی پێکهێنەرەکانی هەوا، ئەوەتا ڕێژەی غازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە شاری مۆڵگە پیشەسازیەکاندا بە جۆریك زۆربووە کە پیسبوونی بایەلۆجی لێ پەیدابوە و بۆتە هۆی هەندێ نەخۆشی و ڕوودانی تەنگەنەفەسی و خنکان، وەکو ئەو دۆخەی کە لە شاری لەندەن و تۆکیۆو (دۆڵی مێز) لە بەلجیکادا هەیە.

بۆ پاراستنی ژینگە لە پیسبوونی پێکهێنەرەکانی هەوا چەند پێشنیارێك کراوە،لەوانە: دەبێ کارگەکان دوور لە جێگای نیشتەجێبوونی چڕی دانیشتوان دابمەزرێن، لە جێگایەکدا کە سەوزایی وشینایییەکی فراوان دەوری دابێت بۆئەوەی بتوانێت هەواکەی بپاڵێوێت و پاکی بکاتەوە. هەندێ دەولەتیش لە هەڵەی هەندێ دەوڵەتی تر سوودیان وەرگرت و فێری ئەوە بوون کە وەکو ئەوان بە شێوەی هەڵە جێگەی دامەزراندنی کارگەکان دەستنیشان نەکەن. هەروەها دەبێ دووکەڵکێشی بەرزبەرز و دووکەڵ پاڵێو(المفلترە) لە کارگە پیشەسازیەکاندا دابمەزرێنن. ئەگەر بە پێویستیش زانرا ئەوا هەندێ کارگە لە جێگە کۆنەکانی خۆیانەوە بگوازرێنەوە بۆ جێگایەکی تر کە بۆ ساغی و سەلامەتی مرۆڤ جێگای دڵنیایییەکی زیاتر بێت.

## ٢. پیسووونی ئاوەکان:

پاراستنی ئاو لە پیسبوون کارێکی زۆر گرنگ وپێویستە بۆئەوەی تەندروستی مرۆڤ وژیانی ماسی و گیانلەبەرانی تری ناو رووبار ودەریا و زەریاکان بپارێزرێت.ئاوەکان چۆن پیس دەبن ؟ ئاوی پیس و پاشەرۆو پاشماوەی رەق کە شارەکان فرێی دەدەنە ناو رووبارەکانەوە وادەکات ئاوی خواردنەوە توشی پیسبوون بێت و هەرچی مەرجی تەندروست و ئاسایییە پێوەی ناهێلێت.لەگەڵ دروستکردنی کارگەوپاڵێوگەوپیشەسازی قورس لەسەر رۆخی رووبارەکان وکەناری دەریاوزەریاکان ،هەروەها ئەو پیسبوونەی کە کەشتیە نەوتبەرەکان لە ئاوی زەریاو دەریاکاندا دروستی دەکەن.

بۆ پاراستنی دەرامەتی ئاو لە پیسبوون پێویستە ئەمانە بکرێت: دەبێت ئاوە پیسەکان پێش ئەوەی بگەنە رووبارەکان چارەسەر بکرێن و ماددە

زیانبەخشەکان و ڕێژەی خاشاك و خڵتەی پیسیان لێ کەم بکرێتەوە.
هەروەها پێویستە ئاوەڕۆی پرۆژە پیشەسازیەکان وئاوەڕۆکانی باران بکرێتە سەر ئاوەڕۆیەکی گەورەتر کە لە کۆتاییەکانیان پێش ئەوەی بگەنە ڕووبارەکان پیساییەکانی تێدا چارەسەر بکات. هەروەها جێگەی کارگە پیشەسازیەکانیش دەبێت وەها بن کە زیان بە شارەکان نەگەیەنن و دەشتوانرێت یاسای بەهێز دابنرێت بۆ پاراستنی دەرامەتەکانی ئاو کە کەس نەتوانێت پاشەڕۆی شل و توندی بکاتە سەر و ئاوی ڕووبارەکانی پێ پیس بکات . بواریش بە خەڵك بدرێت کە چاودێری ئەم لایەنە بکەن، وهۆشیار بکرێنەوە لەبارەی گرنگی دەرامەتی ئاو بۆژیان وتەندروستی مرۆڤ و ئاگاداربکرێنەوە لە بەفیڕۆنەدانی سامانی ئاو و دەست پێوەگرتنی.

## ٣. پیسبوونی خاك:

ئادەمیزاد بەر لە شۆڕشی پیشەسازییش فاکتەر بووە لە پیسبوونی خاك، چونکە هەر لەسەرەتاوە دەستی کرد بە بڕینی دارستانەکان و لەوەڕاندنی ئاژەڵ بە شێوەیەکی زۆر و بێ سەروبەر لە ناوچە نیمچە ووشکەکاندا، ئەم کارەش ڕامالّرانی خاکەکەی ئاسان کردو سەرەنجام سیفەتە چاکەکانی نەهێشت و بوو بە خاکێکی کەم پێزو کەم بڕشت.

لەسەردەمی سەردەمی پیشەسازی و کشتوکاڵی نوێ بواری تازەتر بۆ وێرانکردنی خاك هاتە گۆڕێ ، چونکەکردارێکی زۆری هەڵدڕین و هەڵکەندن بۆ کانزاکاری ئەنجام درا ، و خاك بۆ دروستکردنی خشتی سوور بەکارهێنرا کاتێ چاڵێکی زۆر لە دەوروبەری ئەو کوورەوکارگانە لێدران کە شێوەی سروشتی

خاكەكە دەشێوێنێ ، وپڕ دەبێت لـە ئـاوی پـیس و ناچـار دەرمـانی قڕكـەری مێرووی تێدەكرێت كە ئەمەش خاكەكە پیس دەكات.

بۆپاراستنی خاك لە پیسبوون ، پێویستەناوچە پیشەسـازیەكان كـە دەبنـە هۆی ئەم پیسبوونە دابڕیكرێن و تەریك بن و بە دەوروپشتی دا تـا ماوەیـەكی فـراوان پشـتێنەیەكی رووەكـی وسـەوزایی شـین بكرێـت ، و چـاڵ و زەویـە هەڵكەنـدراوەكانیش بكـرێن بـە دەریاچـە و سـەیرانگە. هـەروەها دەرامـەتی دارسـتانەكان بپـارێزرێن و رێگـا نـەدرێت بـە شـێوەیەكی كوێرانـە دارەكـان ببڕدرێن و لەوەڕاندنی بە لێشاوو بێ سەروبەر وبێ سەرپەرشتی بوەستێنرێت، هەروەها دەبێت ئەوشێوازە كشتوكاڵیانەش قەدەغە بكرێن كە گونجاو نین بۆ ئـــەوەی خاكەكـــە توانـــای بەرهـــەمهێنانی تێدابمێنێتـــەوە و كـــەم هێـــز نەبێت،سنووریش دابنرێت بۆ سەرپێچی كەران و سزابدرێن

# بەشی دەیەم

## جوگرافیای رامیاری

## دەولەتان و پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان

### ١- دەولەتان وتایبەتمەندێتیان و ئەو قۆناغانەش کە پێیدا تێدەپەڕن:

دەولەت یەکەم جار لە ناوچەیەکی بچووکدا دادەمەزرێت وگەشە دەکات تا دەگاتە لوتکەی فراوانی ، ئەو ناوچەیەش کە دەولەتەکەی تێدا دادەمەزرێت (ناوکە مۆلگە) یا (ناوکە) یان (دلّ) ی پیّ دەلّێن، وەکو دوورگەی فەرنسا لە حەوزی پاریس کە بۆتە ئەو ولاتەی فەرەنسای ئێستا، هەروەها وەکو ناوچەی نەجد کە بۆتە ئەو ( پاشانشینەی عەرەبی سعودیە)ی ئێستا.

دەولەت وەها پێناسەکراوە کە :(( بریتیە لە یەکەیەکی رامیاری و یاسایی، کەپەیوەستە بە هەرێمێکی دیاریکراو و حکومەت و گەلێکی دیاری کراو)).

هەموو دەولەتێکیش شێوەی رامیاری خۆی هەیە کە دوو سیفەتی سەرەکی پێوە دیارە، ئەم دوو سیفەتەش لە ئاسان کردن یان لە پەکخستنی هێزی شاراوەی دەولەتەکەدا گرنگی خۆیان هەیە:

أ- پلەی سەقامگیربوونی ناوەخۆ : کە ڕەنگدانەوەی کارلێکردنی نێوان بنەماکانی یەکگرتن و لێکهەلّوەشان دەنوێنێت ، یان هی نێوان هێزەکانی یەکگرتن و هێزەکانی پچرپچربوون دەنوێنێت.

ب- پەیوەندی دەولەتەکە لەگەلّ دەرەوە: کە ئەمەش لەوانەیە چ لە ڕووی شێوە و چ لە ڕووی کاتەوە جۆریەجۆر بێت و بشگۆرێت، واتا لەوانەیە دەولەتێك لە ڕێگەی رامیاری دەرەوەی لەگەلّ دەولەتە دراوسێکانیدا پەیوەندی دۆستانە ببەستێت. لەوانەشە هەندێك لەو دەولەتانە ببن بە

هاوپەیمان ، بەڵام ئەوەندی پێ ناچێت ئەم پەیوەندیە دۆستانەیە لە کاتێکی تر و دۆخێکی گۆڕاودا دەبێت بە دوژمنایەتی.

ئەو قۆناغانەی کە دەوڵەتی پێدا تێ دەپەڕێت ئەمانەن:

١. قوناغی دامەزراندن:

ئەو قۆناغەیە کە دەولەت هەموو هێز و توانایەکی خۆی بۆڕێکخستنی کاروباری ناوەخۆ و گەشەپێدانی دەرامەتی ناوخۆ و پێکەوەبەستنی پارچەکانی و بە هێزکردنی پەیوەندی نێوان ڕەگەزە مرۆییەکانی ناوەخۆی تەرخان دەکات و بیر لە فراوانخوازی و هێرشکردن ناکاتەوە و رامیاری بەرگری وخۆپاراستن دەگرێتەبەر، بەڵکو سەروەری خۆی دەپارێزێت. وەك کۆمارەکانی ئەمریکای لاتینی.

٢. قۆناغی لاوێتی:

لەم قۆناغەدا دەولەت دەگاتە ئەوپەڕی چالاکیەکانی لە رێکخستنی کاروباری ناوەخۆو بەهێزکردنی یەکێتی هەرێمایەتی و کۆکردنەوەی ڕەگەزە مرۆییەکانی لە دەوری خۆی و چەسپاندنی سەقامگیری ناوەخۆ و خۆشگوزەرانی ئابووری بە سوود وەرگرتن و وبەرهێنانی دەرامەتەکانی ، جا ئیتر گەشەکردن و هێزی خۆی تەواو دابین دەکات. وەك ئیتالیا و ئەڵمانیا.

٣. قۆناغی پێگەیشتن:

دەولەت دوای کۆششی بۆ دارشتنەوەی خۆی ئیتر پێویستی بە هێمنی وئارام گرتن هەیە تا بتوانێت دەرامەت و تواناکانی خۆی بخاتە کار و بیانپارێزێت ، بۆیە لەم قوناغەدا حەزی لە ئاشتیەو گیروگرفتەکان لە ڕێگەی دبلۆماسی چارەسەر دەکات لەوانەشە هەندێکیش لەپەلپ و ویستی خۆی دابەزێت و

قایل بێت ، بەڵام لە جەنگ کردنیش ناسلەمێتەوە ئەگەر هەست بە مەترسییەك بكات كە تووشی سەلامەتی یان ماڵ و موڵكی خۆی بێت. وەك دەولەتە هاوپەیمانەکان پیش جەنگی یەکەمی جیهان.

### ٤. قۆناغی پیری:

ئەو قۆناغەیە کە دەولەتەکە تووشی هەڵوەشاوی دەبێت و هێزی دەولەتێتی لاواز دەبێت ، ئەم دۆخەش یان بە هۆی کارەساتی ناوەخۆ یان بە هۆکاری تری دەرەوە تووشی دەبێت، سەرەنجامی ئەوەش ئەوەندە بێ هێز دەبێت کە ئیتر ناتوانێت ئەو ئیمپراتۆریەتەی لە قۆناغی لاوێتی دا دایمەزراندبوو بیپارێزێت و دەکەوێتە بەر هەڵپەو تالانکاری دەوڵەتانی تر، ئەوەبوو (ئیمپراتۆریەتی عوسمانی) و (ئیمپراتۆریەتی نەمسا – مەجەر)یش بەم قۆناغەدا تێپەرین.

بەڵام خولی گەشەکردنی دەولەت لەوانەیە تەواو نەبێت و نەگاتە دوا قۆناغ بە هۆی ئاستی تەمەنی رژێمەکانی حوکمەوە، ،واتا دەولەتێك لەو دەولەتانە لەوانەیە بگاتە قۆناغی پێگەیشتن و پیری ودوایش بگەرێتەوە بۆ قۆناغی لاوێتی و بە هۆی هێزێکی لە ناکاوەوە بکەوێتەوە چالاکی.

### ٢- بنەماکانی دەوڵەت:

دامەزراندن و بەردەوامی بەهێزبوونی دەولەتێك لە ریزی دەوڵەتانی جیهاندا لەسەر چەند بنەمایەك بەندە کە پێویستە بن ، ئەم بنەمایانە زۆرن و ئەمانەن:

أ-(بنەما سروشتیەکان) ب- (بنەما مرۆییەکان) ج- (بنەما ئابوورییەکان).

ئەم بنەمایانە پێکەوە کار لە قەوارە (کیان)ی دەولەتەکە دەکەن و لەم کارەیاندا جیاوازیان نییە و هەرکارێکیش لەم کارانە گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە و لەگەڵ کارەکانی تردا هاوسەنگە.

#### أ- بنەما سروشتیەکان:

ئەم بنەمایانە جێگا وقەبارەو شێوەو بەرزونزمی وخاك ودەرامەتی سروشتی ودەرامەتی ئاوو، ئاووهەوا و رووکی خۆرسکی دەولەتەکە دەگرێتەوە.

جێگا: یارمەتی دارشتنی جوگرافیایی دەولەتەکە دەدات کە لە ناو دەولەتە دراوسێکانی دا بتوانێت پشتی پێ ببەستێت و جێگای خۆی پێ بچەسپێنێت، بۆ دەولەت ئەوەش گرنگە کە بتوانێت بە ئاسانی لەگەڵ جیهاندا پەیوەندی بکات. دەولەتانی قەراغ واتا ئەوانەی کەوتوونەتە سەرپەری کیشوەرەکان ، یان ئەوانەی کە دورگەکانی کەناریان بەدەستەوەیە ،وەکو بەریتانیا و یابان و ئەندەنوسیا، ئەوانە لەو جێگایانە سوودمەندن چونکە نزیك بە رێگە بازرگانییەکانی جیهانن، هەروەها جێگای ئەو دەولەتانەش کە بەسەر دوو دەریا یان زیاتر دەروانن، وەکو فەرەنساو وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بە جێگای گرنگ و بایەخدار دادەنرێت، دەولەتانی واش هەیە کەوتووتە سەر دەریاش کەچی لەبەر دووری لە رێگا سەرەکییەکانی بازرگانی جیهانەوە

چەپەو دوورە دەستە. هی واش هەیە دەروێکی نەکراوەتەوە بۆ سەر دەریا( کەتوونەتە ناوەوەی کیشوەرەکانەوە) وەك ئەفغانستان، پاراگوای ، پۆلیڤیا، چیك ،سلۆڤاکیا، هەنگاریا(مەجەڕ) ،نەمسا،چاد،نەیجەر،مالی و زامبیا و هی تریش ، ئەمانە پەیوەندیان لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا گەلێك گرانە.

قەبارەو ڕووبەری دەوڵەت: بە پێوەری گرنگی هێزو بایەخی ئەو دەولەتە دادەنرێت، چونکە دەولەتی رووبەر فراوان دەرامەتی لە دەولەتێکی رووبەر بچووك زۆرترە و جێگای دانیشتوانی زۆرتری تێدا دەبێتەوەو دەشتوانێت گوزەرانیان دابین بکات، بەمەش دەتوانێت خۆی لە دەست درێژکاری دوژمن بپارێزێت، هەرچی دەولەتی بچووکیشە ئەوەی لە تواناادا نی یە.

شێوەی دەوڵەت: دوو دەولەت نییە شێوەیان بە تەواوەتی لە یەك بچێت، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێت هەموو دەوڵەتەکان لە ڕووی شێوەی گشتیانەوە بکرێن بە سێ کۆمەڵەی گەورەوە کە (کۆمەڵەی شێوە پتەو) چاکترینانە وەك فەرەنسا و میسر. ئەم شێوە پتەوانە نیشانەیان ئەوەیە کە سنوورەکانیان لە گوێرەی ڕووبەرەکەیان کورتترە، ئەمەش سیفەتێکی ستراتیژیە چونکە خاڵی لاوازی ئەم جۆرە سنوورە کورتانە کەمترە بە بەراورد لەچاو سنوورە درێژەکان. هەرچی(کۆمەڵەی شێوەکشاو– درێژەوەبوو) وەکو شیلی و نەرویج ئەوە پێویستی بە سیستەمێکی دوورو درێژی گواستنەوە هەیە ، کێشەو گرفتی زۆریشیان تووش دەبێ لە پاراستنی ناوچە دوورەکاندا و بەرێوەبردنیشی گرانە. بەلآم کۆمەلەی سێهەم بریتیە لە (دەولەتە پچڕپچڕەکان) وەکو دەولەتە ئەرخەبیلەکانی یابان و فلیپین و ئەندەنوسیاو کە لە دوورگەیەکی زۆر پێکهاتون، ئەمانە بە هۆی پێشکەوتنی ڕێگای

هاتوچـــۆکردن وئـــامرازی گواســـتنەوە، پەیوەنـــدی نێـــوان پارچـــەکانیان ئاسانتربووە.

**بەرزی ونزمـی زەوی:** دیاردەیەکـە لـە هـەموو دیـاردە سرووشـتیەکانی تـر زیاتر کاریگەری لەسەر دەولەت هەیـە، چـونکە هەرچـەند دەولـەتێك شـێوەی جۆراوجـۆری بـەرزی و نزمـی تێـدا بێـت ئـەوا ئـەو دەوڵەتـە بـەهێزتر دەبێت،چونکە دەرامەتی سرووشـتی جۆراوجـۆرو ئاووهـەوای جیاجیـای تێدا دەبێت کە ئەمەش تەواوکاریەکی ئابووری بۆ دەرەخسێنێت و هێزیشی زیـاتر پێ دەبەخشێت، جگە لەوە جۆری بەردان و بەرێخستنی ئاویش پەیوەندی بە بـەرزی و نزمـی یـەوە هەیـە. دەشـتوانین بڵـێین کـە باشـترین ژینگـەی نیشتەجێبوون و ئابووری ئەو دەشتانەن کە دەرامەتی ئـاوو خـاکی بـە پیتـی زۆرە، ئەو جۆرە دەشتانە بە ئاسانیش ڕێگاوبانی هاتوچۆو هێڵی ئاسنی پێدا ڕادەکێشرێت.

**ئاووهـەواش:** کاریگەری گەورەی بۆ سەر دەولـەت هەیـە، چـونکە ڕەگـەزی بنەماکانی کە بریتین لە گەرمی و شـێ و دابـارین کـار لـە چـالاکیی ڕۆژانـەی مرۆڤ دەکات و کاریگەریان هەیـە بۆسـەر جـۆری چـالاکیی ئـابووری و جـۆری بەروبومی کشتوکاڵ و بڕی ئەو ئاوەی کە بۆ کشتوکاڵ وبـەکاربردنی ڕۆژانـەی مرۆڤ پێویستە ،لەبەرئەوەی بە چەندێتی هەڵمانی ڕۆژانە بەستراوە. هـەروەها سیفەتی ئاووهەوا تا ڕادەیەکی زۆر کار دەکاتە سەر جۆری ڕووەکـی خۆرسـك لەو دەولەتەدا، ئایا ئەو ئاووهەوایە ئەوەندە لـەبارە کـە لـەوەرگای سروشـتی وخۆرسکی تـەواوی پێ شین ببێت؟ یان نالەبارەو وولاتـەکەی ووشك و بیابانە.

**دەرامەتە سروشتیەکان:** دەتوانرێت هەموو خاسیەت وسیفەتە سروشتیەکانی نـاو دەولەتەکـە بـە دەرامـەتی سروشـتی دابنرێـت، لێـرەدا مەبەسـتمان بـە

تایبەتی لە خاك و سامانی کانزا و ئەودەرامەتی ئاویەشە کەچەندین دەرامەتی تری ئابووری یە لە خۆدەگرێ.

لەبەر ئەوەی دەرامەت بە شێوەیەکی نایەکسان بە سەر هەمووولایەکی زەویدا دابەش بووە ،بۆیە هیچ دەولەتێك نییە کە بتوانێت(خۆبژێوی) بەتەواوی وبەبێ کەموکووری بهێنێتەدی، هەرچەندە یەکێتی ئەورووپاو وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دوو قەوارە گەورەکەی جیهان نزیکن لەوەی کە بگەنە خۆبژێوی کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێویستیان بە هەندێ کەرستەی خاو هەیە کەنیانە. لەوانەیە دەولەتێك هەندێ جۆری کانزای هەبێت وەکو نەوتی ولأتانی کەنداو و نەوتەکەی لیبیا و جەزائیر و فۆسفاتی مەغریب و خاوەکانی خەلۆزی بەریتانیا و ئەلمانیا و ئاسنی فەرەنسا.

خاك دەرامەتێکی سروشتی زۆر گرنگە و بایەخدارە چونکە دوای هەزاران ساڵ دێتە دەست، لەبەر ئەوە ئەو دەولەتەی خاکی چاك و بە پیتی هەیە وەکو هیندستان و میسر و چین و دەولەتانی لەو جۆرە ، بە دەولەتی بەختەوەر دادەنرێت.

ب- بنەما مرۆییەکان:

دانیشتوان سامانی مرۆیی دەولەتن کە گیان بەبەر دەولەتدا دەکەن، چونکە ئەگەر ئەوان نەبوونایە هیچ وەبەرهێنان و ئاوەدانکردنەوەو شارستانێتیەك لە دەولەتەکەدا نەدەبوو، گەلێ جاریش ژمارەی دانیشتوان بە پێوەری هێزی دەولەتەکە دادەنرێت لە تەرازووی جیهانی دەولەتاندا.

پێوەر بۆ ژمارەی دانیشتوان بە پێی رادەی چالاکیان و رێژەی لاوەکان و کارکەرانی ژن و پیاو و مامناوندی تەمەنیان دەبێت، هەندێ لە زانایانیش

وەك پێوەرێك بۆ مامناوەندی تەمەن(ماوەی ژیان)و ژمارەی دانیشتوان پشت بە زیندەیی و هێزی میللەت دەبەستن،وەك لە ولاّتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا وسویسرا وبەرازیل.

نەوە(السلالة) وزمان وئایین دەكەونە چوارچێوەی ئەم باسەوە، گەلێ دەولەتیش هەن لەچەند نەتەوەیەك پێكهاتوون، ئەو نەتەوانە بە هەموویان دەولەتێكیان هەیە وهەركەسەش لەوان خۆی بەهاولاتیەكی ئەو نیشتمانە دەزانێت، وەك وولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا وسویسرا و و بەرازیل .لە بەرامبەریشدا گەلێ دەولّەتی تر هەن كە لە چەند نەتەوەیەك پێكهاتوون بەلاّم تەنها بوار بەیەك نەتەوە دراوە ولاّت بەڕێوەببات ونەتەوەكانی تر فەرامۆش كراون وبێبەش كراون لە حوكم كردنی ولاّتەكە وەك توركیاوسوریا وئێران.

زمان ئەوەندی كە بنەمایەكی گرنگی نەتەوەیە ، ئەوەندەش هێزی دەولەتی پێ زیاتر دەبێت، چونكە زمان ئامرازی دووان و ڕادەربرین و لێك گەیشتن و گەیاندنی بیرو كەلەپورە ، لەبەر ئەوە ئەوانەی بە یەك زمان دەدوێن زیاترلێك نزیكدەبنەوەو یەكتریان خۆش دەوێت و دەروونیان بۆ یەكتری دێتە جۆش.چەندین ولاّتیش هەن كە زیاتر لە یەك زمان بە زمانی فەرمانی ولاّتە دادەنرێت وەك سویسرا و عێراق.ولاّتە داگیركەرەكانیش زۆر هەولّی ئەوەیاندا زمانی خۆیان بسەپێنن بەسەر گەلانی ئەو ولاّتانەی كە داگیریان كردن بێ ئەوەی ئەو مەرامەیان بێتەدی هەرچەندیش شوێنەواری ئەو سیاسەتە لە زۆر ولاّت وشوێندا دەبینرێت وەك زمانی ئینگلیزەی فەرەنسی و پورتوگالی لە زۆر لە ولاّتانی كیشوەری ئەفریقیا،وئینگلیزی لە هیندستان و پاكستان وبەنگلادیش ،ونیسپانی لە زۆر لە ولاّتانی ئەمریكای لاتینی،وتوركی لەباكوری كوردستان و عەرەبی لە رۆژئاوای كوردستان

وناوچــە دابڕێنراوەکــانی باشــوری کوردســتان و فارســی لــە ڕۆژهــەڵاتی کوردستان.

ئایینیش لەو فاکتەرانەیە کەوا کاریگەری لەسەر دەوڵەت هەیە ،چونکە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لێبوردەیی ئایینی بۆتە حاڵەت و دیاردەیەکی قبوڵ کراو لەلایەن زۆربەی هەرەزۆری وڵاتان وگەلانی جیهان،ئەگەر لەدەوڵەتێکیش زیاتر لەنەتەوەیەك هەبوو بەڵام لە یەك ئایین (و لـە یـەك مەزهـەب) یـەك بگرنـەوە ،ئــەوا ئــەم فاکتــەرە زیــاتر دەبێتــە هــۆی یــەکگرتن ولێــك نزیــك بوونـەوەیان.ئـەمڕۆش لـەجیهان چـەندین ئـایینی جیـاواز هەیـە وەك ئیسـلام ومەسـیحی(کریسـتیان) و یـەهودی(جوولەکـە) وبـوزی و کۆنفۆشیۆسـی و هیندۆسی و بت پەرست و بێ ئایینەکان .

ج- بنەما ئابووریەکان:

بێگومان دەرامەتی ئابووری بە هەموو جۆرەکانیـەوە ، بـە هۆکـارێکی بنچـینەیی هێـزو پایـەی دەوڵـەت دادەنرێـت. هـەموو برِیـارێکی رامیـاری پێویستیش کە دەری دەکات لەسەر بـوونی توانـای ئـابووری ئـەو دەولەتـە وەستاوە. بنەما ئابوورییەکانیش ئەگەر لـە ڕوانگـەی جوگرافیـای رامیایـەوە سەیری بکەین بریتیە لە هەر شتێك کە هی دەوڵەت بێت یان هـەر شـتێك کـە دەوڵەت بتوانێت دەست خۆی بخات یان بیگاتێ کـە سـتراتیژیەتی خـۆی پـێ قایم بکات،چونکە بنەما ئابوورییـەکان جۆراوجـۆرن، هەنـدێکیان هەسـت پـێ کـراوە وەك خــاك ، هەنــدێکیان نــاپێورین، وەك ســەرکردایەتی ، هەشــە دەپێورێـــت وەك دانیشـــتوان ، هەشـــە بـــە گـــران دەپێورێـــت وەك نیشتمانپەروەری کە دەبێتە پاڵنەر بۆ دڵسۆزیی لـە کـارکردن، و زیـادکردنی بەرهەم .

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا پێویستە ئەو برە کەرەستە خۆراکە پێویستە فەراهەم بکرێت کە بەشی بەخێوکردن و خۆشگوزەرانی دانیشتوان بکات. پێوانەش بۆ رادەی پێشکەوتنی دەولەت پەیوەستە بە بری ئەو سوعرە گەرمیەی کە تاکەکەس لە ژیانی رۆژانەیدا بەکاری دەبات و لەگەڵ ئەوخۆراکە جۆراوجۆرانەی رۆژانەش کە تا چەند پرۆتین و ڤیتامینیان تێدایە. ئەو دەوڵەتەی بتوانێت لە هەموو روویەکەوە خۆبژێوی خۆی دابین بکات بە دەولەتی بەهێز دادەنرێت لە چاو ئەو دەوڵەتانەدا کە کە پشت بە هاوردەنی دەبەستن.

هەروەها بوونی کەرستەی خاوی کانزایی لە دەوڵەتێکدا کاریگەری لەسەر بەهێز بوونی ئەو دەوڵەتەدا هەیە ، بەلاّم گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە ئەم دەوڵەتە بتوانێ خۆی ئەم کەرستە خاوانە وەبەربهێنێت. توانای دەولەتیش بۆ دامەزراندنی پیشەسازی بەندە بە بوونی کەرەستەی خاو کە پیشەسازیە جۆراو جۆرەکان پێویستیان پێیەتی.

بەروبوومی پیشەسازیش بە تایبەتی پیشەسازی قورس بۆ دەوڵەتێك پێویستە بۆ ئەوەی بیەوێ بەردەوام بەهێز بمێنێتەوە، چونکە جگە لەوەی دەبێتە هۆی دابین کردنی هەموو کەلوپەل و پێداویستیەك وئامێر ومەکینەو ئامرازێکی بەرگری و،لە هەمان کاتیشدا ناچار نابێت کەلەدەرەوە هاوردەی بکات(بیهێنێت)،بەڵکو بەپێچەوانەشەوە دەتوانێ بۆدەرەوەی بنێرێ ئەوسا دراوی بیانی گرانبەهای دەست دەکەوێ کەبەهۆیەوە دەتوانێ ئابووری نیشتمانی خۆی پێ ببوژێنێتەوە.

### ٣- سنووری رامیاری و جۆرەکانی:

سنووری رامیاری بریتیە لەو هێڵانەی کە زەوی دەوڵەتی پێ دەستنیشان دەکرێت و لەم زەویەش دەوڵەتەکە سەروەری خۆی پیادە دەکات، ومافی سوود لێ وەرگرتن و وەبەرهێنانی بەسەردا هەیە، کەلەم چوارچێوەیەدا بواری وشکانی و ئاوی و ئاسمانیی ئەو زەویە دەگرێتەوە.

بەوەش سنووری رامیاری کاروفرمانێکی زۆر بەجێ دەگەیەنێت وەك: دابین کردنی ئاسایش و پاراستن لە دەستدرێژی و داگیرکاری لە ناکاوی دوژمن ، وپاراستنی بەروبوومی ئابووری ، هەروەها سنووری رامیاری ئەو یاسایانەش دەستنیشان دەکات بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی لەو سنووردا بژین بچنەژێر رکێفیەوە .

سنووری رامیاری بەپێی پەیدابوونی و بەپێی ئەو جێگایانەی کە پێیداتێدەپەرێت پۆلێن دەکرێن ، بۆ چەند جۆرێك لەوانە:

### ١- سنووری سروشتی:

ئەو سنوورانەن کە بە ناوچە چیاکان و، ودەریاچەکان، وهۆر وزۆنگاوەکان، ورووبارەکان، ودارستانەکان و بیابانەکان دا دەروات.

چیاکان نیشانەیان ئەوەیە کە دیاردەیەکی بەرزو سەختن و دانیشتوانیان بە گشتی کەمە،بۆیە بۆ ئەوە لە بارن کە ببن بە سنووری دابرکەر و جیاکەرەوەی نێوان دەوڵەتەکان، هەروەها دەشبن بە هێڵی پارێزگاری و بەرگری کە دەولەتەکان دەتوانن بیکەن بە شوورە و خۆیانی پێ بپارێزن،بۆ نموونە وەك چیاکانی هیمالایا لە نێوان چین و هیندستان، چیاکانی ئەندێز لە نێوان شیلی و ئەرجەنیتن ، چیاکانی برانس لە نێوان فەرەنسا و ئیسپانیا.

لەوانەشە سنووری رامیاری شان بە شانی رووبارەکان بکشێت، بەلآم هەموو

شارستانێتیە کۆنەکان مەگەر بە دەگمەن رووباریان کردبێت بەسنوور لە نێوان دەوڵەتە هاوسێکاندا، بگرە بەپێچەوانەوە واتا رووباریان بۆ پەیوەندیکردن بەکاردەهێنا لە نێوان یەکتریدا ،بەلأم ئێستا ئەو کارە گرانە، لەبەرئەوە دەبینین سنووری رامیاریەکان لە ئەورووپادا شان بەشانی هەندێ بەشی رووبارەکانی دانوب و راین و لقەکانیان دەڕوات ، بۆنمونە رووباری دانوب بۆتە سنووری نێوان رۆمانیا و بولگاریا و سنووری نێوان مەجەر(هەنگاریا) و سربیا. گەلێ رووباری تریش هەن کە بوونەتە سنووری رامیاری نێوان دەوڵەتان ، وەك رووباری (شەتتولعەرەب) لە نێوان عێراق وئێران ، ورووباری (ریۆگراند) لە نێوان وولأتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و مەکسیك ،و رووباری (کۆنگۆ) کە کۆنگۆی دیموکراتی و کۆنگۆی برازافیل و کۆماری ئەفریقیای ناوەراست.

سنووری واش هەیە بەسەر دەریاچەی هاوبەشی نێوان دوو دەولەت یا زیاتردا دەڕوات وەك سنورەکانی نێوان وولأتەیەکگرتوەکانی ئەمریکا و کەنەدا کە بەسەر پێنج دەریاچە گەورەکەدا دەڕوات، وە سنووری نێوان کینیا و ئۆگەنداو تەنزانیا کە بەسەر دەریاچەکەی ڤیکتۆریا دا دەڕوات.

لەوانەشە سنووری رامیاری بەسەر هۆڕوزۆنگاوەکان و دارستان و بیابانەکاندا بڕوات، هۆڕوزۆنگاوەکان ئەوەندەی دارستان و بیابانەکان زۆر نین و درێژەیان نی یە ، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا گرنگە چونکە بە بەربەستێك دادەنرێت بە تایبەتیش لە وەرزی زستاندا، نموونەی ئەم جۆرە سنوورەش کە بەسەر هۆڕوزۆنگاودا دەڕوات وەك سنووری نێوان بەلجیکا و هۆلەندا.

دارستانەکانیش کاتی خۆی و ئێستاش بەدیاردەیەکی جیاکەرەوەو پاراستن دادەنرێن لە نێوان گەلان، کەچی سەرەرای ئەوەی کە دانیشتوانیان

کەمە ، کەچی وەك جاران بەو سنوورە جیاکەرەوە توندە دانانرێن، چونکە رووبەرێکی زۆری براوە بە تایبەتی لە هەرێمە مامناوەندەکەی باکوور،نموونەی ئەو سنوورانەش کە لەگەڵ دارستانەکاندا گونجاون ئەوەیە کە لە دارستانەکانی باکووری رۆژهەلاتی ئەوروپادا هەیە، ئەو دارستانانە فینلەندە لە روسیا جیادەکاتەوە و لیتوانیا لە پۆلەندە جیادەکاتەوە، هەروەها سنووری نێوان فەرەنسا و سویسراش هەر لەم جۆرەیە. لە ئەفریقیاش دیسان دارستانەکان سنووری نێوان دەولەتەکانی ناوچەی کەمەرەیی جیادەکاتەوە، ئەو دارستانانە کۆمارەکانی کۆنگۆو کامیرۆن و گانایان لەو ناوچەیەدا لێك جیاکردۆتەوە.

لەوانەشە سنوورە رامیاریەکان لەگەڵ بیابانەکانیشدا بگونجێت چونکە بیابانەکان دەگمەنن و دانیشتوانیشیان کەمە و کەم ئاون و خەلکی بە گران تێیدا گوزەر دەکەن مەگەر لە چەند رێگایەکی کەمەوە نەبێت، نموونەی ئەم جۆرە سنوورەش ئەوەی نێوان نەیجەر و لیبیا و ئەوەی نێوان نەیجەر و مەغریب و، ئەوەی نێوان چاد و سوودان و لیبیا و ئەوەی نێوان مالی و مۆریتانیایە، نیشانەی ئەم جۆرە سنوورە ئەوەیە کە هێلێکی راستە و پێچوپەنای کەمە.

٢- سنوورە داتاشراوەکان: سێ جۆرن:

أ- سنووری فەلەکی(ئەسترۆنۆمی): ئەو سنوورانەن کە بە پێی هێڵەکانی درێژی و بازنەکانی پانی گۆی زەمین داتاشراون، کە بەشێکی زۆری سنووری نێوان وولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو کەنەدا لەم جۆرە سنوورەن کە بازنەی پانی (٤٩)ی باکوور کراوە بە سنوور. هەروەها لە کیشوەری ئەفریقیاشدا ئەم جۆرە سنوورە زۆرە.

ب- سنووری بیرکاری(ئەندازەیی): بریتیە لە هێڵێکی راست کە لە نێوان دوو خاڵ لەسەرخاکێکدا کێشراوە، ئەم جۆرە سنوورە هەست و ویستی ئەو گەلانەیان خستۆتە پشت گوێ کە حەزدەکەن یەکبگرن ولە یەك دەولەتدا بژین، نەك هەر ئەوەندە بگرە ئەم جۆرە سنوورە دەستکردانە کۆسپ و تەگەرەی زۆریشی خستۆتە بەردەم یەکگرتنەوەی ئەم گەلانە،چونکە لەلایەن دەولەتە داگیرکەرەکان دانراون،ئەوەی سەیری ئەم جۆرە سنوورانە بکات هەست دەکات کە ئەم سنوورانە بریتین لە چەند هێڵێکی ئەندازەیی (بیرکاری) کەلەگەڵ هیچ دیاردەیەکی سروشتی ناڕوات،وەك سنوورەکانی نێوان هەرچوار پارچەی کوردستان.

ج- سنووری پێچەکان: ئەو سنوورانەن کە چەند خاڵێك بە شێوەی کەوانەو هێڵی ڕاست بەیەکتر دەگەیەنن،کە ئەمەش بۆ دەستنیشانکردنی سنوور لە لە نێوان ناوچەیەکی دیاریکراودا دادەنرێت، وەك سنووری نێوان سۆماڵ و ئەسیوبیا، هەروەها سنووری کۆماری کۆنگۆی دیموکراتی(زائیر) و کۆنگۆ.

## ٤- گیروگرفتەکانی نێوان وڵاتان و هۆکارەکانی:

گیروگرفتێکـی زۆر لـەنێوان وڵاتانـدا پەیـدا دەبێـت کـە دەبێتـە هـۆی پشێوی نێوانیان. شێوەوڕواڵەتی جۆراوجۆری ئەم پشێویە لـە نێـوان وڵاتانـدا بۆیە پەیدا دەبێت چونکە هەریەکەیان دەیەوێت بارودۆخێك و هەلومـەرجێکی تـر بـۆ خـۆی برەخسـێنێت، ئـەو ڕەفتـارەش لەوانەیـە ڕاسـت و ڕەوابێـت، لەوانەشە بەهۆی چاوتێبڕین و هەلپەی فراوانخوازی بێت بۆسەر دراوسێکانی. لەبەرئەوە لێکۆلینەوەی هۆکارەکان و ئەنجامـەکانی پێشـێوی نێـوان وڵاتـان بایەخێکی گەورەی پێدراوە لەلایـەن جوگرافینـاس و جیۆپۆلەتیـەکان ، ئـەم لێکۆلینەوەیـەش پێویسـتە لـە ڕێگـەی بەیەکـەوە بەسـتێکی ووردی نێـوان زانستی جوگرافیا و زانستی ڕامیاری یەوە بێت.

گیروگرفتی نێوان وڵاتان بۆ چوار کۆمەڵە هۆکار دەگەڕێتەوە ، کە ئەمانەن:

١- کـەم بـاوەڕیی (کـەم متمانـەیی) نێـوان وڵاتـان: هۆکـاری ئەمـەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کـە ئـەم پرسـە یـان زۆر قووڵـە لـە نێـوان دوو وڵاتـدا یانیش ماوەیەکی دوورو درێژی بەسەرداچووە، وەك دوژمنایەتی کـۆنی نێـوان تورکیا و روسیا . هەروەها لە ڕق و قینەی جیـاوازی بیروبـاوەڕی نێـوان دوو وڵاتیشەوە پەیدا دەبێت . لەوانەشە بنجی لەسەر دوژمنایەتیـەکی نێـوان دوو شارسـتانێتی یـان دوو نەتـەوەیی داکوتابێـت.هـەروەها لەوانەشـە بـەهۆی دەستوەردان لەکاروباری ناوخۆ وپاشان هێرش وبۆردومان کردنەوە بێت.

٢- دانیشتوان: لەوانەیە زۆربوونی یان کەم بوونـەوەی دانیشـتوان (جاروبـار) ببێتە هۆی پشێوی نێوان وڵاتان، چونکە زۆربوونی دانیشـتوان لەوانەیـە پـاڵ بـەو وڵاتـەوە بنێـت کـە داوای بـوارێکی زینـدەوانی گـەورەتر یـان داوای ناوچەیەکی ئابووریی باشـتر بکـات ،لەوانەشـە کـارێکی وا بکـات کـە بیـەوێت

چەند ناوچەیەك داگیر بكات كە گەلانی تری لیٚ دەژین و هی خۆی نی یە، ئـەم جـۆرە ڕەفتـارەش بـە تایبـەتی لـەو ولاٚتانـە دەوەشـیٚتەوە كـە بڕوایـان بـە فراوانخوازی هەیە وەكو ئەلمانیای ڕۆژانی هیتلەر.

٣- گیروگرفتی فرەنەتەوە:

ڕەنگـە بـوونی چـەند نەتەوەیـەك لـە ولاٚتیٚكـدا ببیٚتـە هـۆی گیروگرفتیٚكـی ترسـناكی ئـەوتۆ كـە پشـیٚوی نیٚودەولەتیشـی لیٚ بكەویٚتـەوە، چـونكە چـەند پیٚكهاتەیەكی كەمی نەتەوەیی كە لە ناو نەتەوە گەورەكەی ولاٚتیٚكدا دەژین و سەر بە نەتەوەی ناو ولاٚتیٚكی ترن لەوانەیە لەگەلٚ ئەو نەتەوە گەورەیە

لیٚك بكەون و دوو دلٚی وبـیٚ متمانـەیی بخاتـە نیٚوانیـان، وەك كەنەدیـەكانی هـەریٚمی (كیوبیـك) كـە لـە نەتـەوەی فەرەنسـایین، و دانیشـتوانی هـەریٚمی (باسك) لە ئیسپانیا و دانیشتوانی (تامیل) لە سـیریلانكا و (هـەریٚمی كشـمیر) لە هیندستان ،و كورد لە عـیراق و توركیـا وسـوریا وئیٚـران و (ئەمازیغیـەكان) یش لە باكووری ئەفریقیا.

٤- هـۆی جـوگرافی: كـە بریتیـە لـە هەولٚـدانی هەنـدیٚ ولاٚت بـۆ دووبـارە دەستكاری كردنی سنووری هەریٚمایەتی خۆی لەسەر حیسابی ولاٚتانی تر بە داگیركردنی خاك و ئاویـان، ئـەم پشـیٚویەش كـە لـەم دۆخـەدا پەیدا دەبیٚـت ڕەنگـە هـیچ پەیوەندیـەكی بـە بنـەمای جوگرافیـەوە نـەبیٚت ، بـەلكو تـەنها پەیوەنـدی بـە گیروگرفتـی ئـالۆزی فراوانخوازیـەوە هەیـە. لـە سـەردەمی ئەمرۆشماندا هیچ ولاٚتیٚك ناتوانیٚت جیٚگـاو سـنووری خـۆی دەسـتكاری بكـات مەگەر بە پیٚشیٚلكردنی ماف و سەروەریی ولاٚتیٚكی تر نەبیٚت.

# فەرهەنگی ووشەکان

| کوردی | عەرەبی |
|---|---|
| **ئـ** | |
| ئاودزەکان | مسارب المياه |
| ئامێرکار | الي |
| ئاودڕ | الجرف |
| ئاگرکار | برکاني |
| ئاواکاری | الاستيطان |
| ئەلکول | الكحول |
| ئاست، ئاقار | مستوى |
| ئۆقرەگر | ثابت |
| ئۆقرە نەگر | غير ثابت |
| ئاراستەکان | الاتجاهات |
| ئاومالك | غرين |
| ئاو بەسەرە | محتقظ مياه السطحية |
| ئاوهەڵچنە | ماصة للمياه |
| ئارەقە، ئاودەردان | النتح |
| ئاسەوار | اثار |
| ئاوەردە | واردات |
| ئاژاوتن | السياقة |
| ئاسنە ڕێ | الطرق الحديدية |
| ئاڕاستەکار | موجه |
| ئاوسەرخەر | مضخة |
| ئاوپرژێن | رشاشة المياه |
| **بـ** | |
| بەش | الباب |
| بەرە بەرە | بالتدريج |

| کوردی | عەرەبی |
|---|---|
| بەند | الفصل |
| بنەماکان | مقومات، اسس |
| بە جیوە | زئبقية |
| باشوورین | الجنوبي |
| با جێگاکرددەکان | الرياح المحلية |
| بای هەمەڕۆژە | الرياح اليومية |
| بارانی هەوری سەرکەوتو | الامطار التصاعدية |
| بارانی بەرزە دیاران | الامطار التضاريسية |
| بەکەلك هێنان | الاستفادة من |
| بەگەنکردن | اختيار، قبول |
| بێ هاوتا | فريد من نوعه |
| بڕگە | قطاع |
| بڕاو بڕ | نهائياً، قطعاً |
| بیابانی | البدو |
| بیابانی گەڕی | البداوة |
| بان، بانو | هضبة |
| بەرەی گشتکاری | قطاع زراعي |
| بێڵ تەپ | تقليب التربة |
| بەکاربەر (کارکەر) | المستهلك |
| بەرهەمهێن | المنتج |
| بەراو | الاراضي السيحية |
| بەنداو | السد |
| بەرایی | القابلية |
| بە بڕشت | القابلية |
| پێوەر | المقياس |

| | |
|---|---|
| بەردەڕێژ | الرصف بالحجارة |

## پـ

| | |
|---|---|
| پێکهاتووی دەریاکرد | تكوينات بحرية |
| پەرداخکردن | الصقل |
| پارچەی سەردابڕ | مقطع رأسي |
| پشتێنە | نطاق |
| پەستان سوک | الضغط الخفيف |
| پەستان قورس | الضغط العالي |
| پچڕ پچڕ | متقطع |
| پۆشاکی ڕووەککرد | الغطاء النباتي |
| پەستانی هەواکرد | الضغط الجوي |
| پێشبینی | تنبؤ |
| پێوانەکاری | المسح، المساحة |
| پەموانە | بذور القطن |
| پەی پێ بردن | دراك، اكتشاف |
| پیشە | المهنة |
| پیشەسازی | الصناعة |
| پیشەدارکردن | التصنيع |
| پارەی خەوتوو | الارصدة المالية(النقدية) |
| پیس بوون | التلوث |
| پەڕش | الشيلم |
| پالە | عامل زراعي |
| پەیین کردن | التسميد العضوي |
| پەیینی کیمیاکار | السماد الكيميائي |
| پێکداچوون | التشابك |
| پێز، پیت | الخصوبة |
| پەیت | مركز |
| پێکدادان | التلاطم |
| پەڕگر | متطرف |

## تـ

| | |
|---|---|
| تاوێر | الصخر |
| تەکان | حركة، اندفاع |
| تەوژم، تەزوو | التيار |
| تێکڕا، تێگرا | متوسط، المعدل |
| تەواوسازی خۆبەخۆ | الاكتفاء الذاتي |
| تایە | المشتل |
| تاوێرکار(ڕەقەن) | صخري |
| تاوێری لمکار | الصخور الرملية |
| تاوێری ئاگرین | الصخور النارية |
| تاوێری نیشتەنیکردن | الصخور الرسوبية |
| تاوێری گۆڕاو | الصخور المتحولة |
| تێدا دەکوژێتەوە | ينتهي اليه |
| تاقتکردن | تخزين، الحفظ |
| تایبەتمەند | تخصص، المتخصص |
| تەوژمی کەنداو | التيار الخليجي |
| تەواوکاری | التكامل |
| تێکچڕژان | التشابك |
| تەریک | منعزل، بعيد |
| تۆڕئاسا | مشبكة، شبكية |
| تەقینەوەی کانی ئاگرینەکان | ثورة البراكين |

## جـ

| | |
|---|---|
| جێگاکرد | المكانية |

| | |
|---|---|
| جێگا حەواڵەکردن | المواضع المشرفة |
| جوغرافیگە | الجغرافي |
| جیّ مەبەست | الهدف |
| جەستەیەکی فڕۆك | جسم طائر |
| جێکار | الاثر |
| جەنگ سار | حربي |
| جەنجاڵ | مزدحم، ازدحام |
| جامباز | دلال، سمسار |
| جۆشخوار | كارة لاحم |

## چـ

| | |
|---|---|
| چڕ | كثيف |
| چەندێتی | الكمية |
| چەندو چۆنی | الكمية و النوعية |
| چۆنیەك | متساو، متشابه |
| چەپ | معزول، منعزل |
| چیا چەماوەکان | الجبال الالتوائية |
| چیا شکست کردەکان | الجبال الانكسارية |
| چاوگێڕی | المراقبة |

## حـ

| | |
|---|---|
| حەوانەوە، حەسانەوە | الراحة |

## خـ

| | |
|---|---|
| خەست | كثيف، مركز |
| خول خواردن | دوران |
| خۆڵبار | مترب |
| خۆڕسك | الطبيعي |
| خاکی هەناسەدار | تربة مسامية |
| خەرمانە | هالة، اكليل |
| خەستەوەبوو | مكثف |
| خەستەوەبوون | التكاثف |
| خاروبار | ارزاق |
| خستنەڕوو | العرض |
| خواست | الطلب |
| خۆرکار، خۆرکرد | الشمسي |
| خۆڵەکەوە، خۆڵەمێش | الرماد |
| خۆهەڵواس | متسلق، متعلق |
| خاسیەتی دەزولەکردن | الخاصية الشعرية |
| خوارتر(نزمتر) | اوطأ |
| خوارین | الاوطأ، السفلي |
| خستنە ژێربار | تسخير، استغلال |

## د

| | |
|---|---|
| داتاشراو | منحوت |
| دیاردە | ظاهرة |
| دەرامەت | مورد |
| دانە | مفرد، عنصر |
| دارایی | المالي |
| دیکار، دیتنکار | الميداني |
| دارین | خشبي |
| داکەوتن | الهبوط |
| دیوی نەدیوی | الجهة الخلفية(غير المرئية) |
| کاریتە | من الجبل |
| داری مێشە | الشربين |
| دەچێتەوە سەر | ينتمي، يرجع الى |
| دەردانەوە، بەرێخستن | التصريف |
| دەڵاندن | الترشح |

| | |
|---|---|
| دزەدەکات | يتسرب |
| داکشان(نیشتاو) | الجزر |
| داڕووتان، داماڵین | التعريه |
| داتاشین | النحت، اصطناعي |
| داڕووشان | الخدش |
| دای لەلێژی | تردي |
| داڵدە ئاو | المرفأ |
| داڕشتن | صياغة، الصب |
| داڵدە | ملجأ |
| دووکەڵکێش | مدخنة |
| دووکەڵپاڵێو | مدخنة مفلترة |
| دەستیاو | سلفة |
| داباڕین | المتساقط |
| دەم دەمی | متذبذ |
| داهێنان | اخترع، ابداع |
| دووهەوا | الجو المتقلب، القاري |
| دەستکردی ماڵەوە | الصناعات المنزلية |
| دەستکرد | يدوي |
| دەست ڕەنگینی | المهارة اليدوية |
| دای لەزۆری | ازداد |
| دەوەن | شجيرات |
| دەرمانی هەرێزکوژ | ادوية مكافحة للادغال |
| داشوشتن | البزل |
| داشۆرکاری | عمليت البزل |
| داخلیسکان | انزلاق |
| دەریا | البحر |
| دەشتی لافاوکرد | السهول الفيضية |
| دەشتی خڵتەکرد | السهول العرينية |

## ر - ڕ

| | |
|---|---|
| ڕەگەز | عنصر، الاصل |
| ڕاستەوخۆ | مباشرة |
| ڕێچکەی با | تيار الهواء، اتجاهه |
| ڕەنووسکرد | الرقمي |
| ڕووناکیکار | الضوئي |
| ڕوانگە | المرصد |
| ڕاماڵین | الجرف |
| ڕاماڵران | انجراف |
| ڕابەرکاری | الترشيد |
| ڕووتەن | جرداء |
| ڕۆچوون | هبوط الارض |
| ڕۆخە دەشت | سهل الساحلي |

## ز

| | |
|---|---|
| زەریا | المحيط |
| زورگان | اراضي متموجة |
| زورگ | التل، التلال |
| زیندەکاری، زیندەوەرزانی | الحيوي |
| زۆقم | الصقيع |
| زیادەگیری | التوسع |

## ژ

| | |
|---|---|
| ژوورینەکان | العليا |

## س

| | |
|---|---|
| سەردەم، سەرزەمان | الازمنة |
| سەرد | شديدة التماسك، صلد |
| سەویە، ئاست | المستوى |

| | |
|---|---|
| سەنگ | الوزن، الحجر |
| سەرکەوتن | الصعود، النجاح |
| سەولْ ئاسا | مجذابي الشكل |
| سوورانەوە | الدوران، التجوال |
| سنوری داتاشراو | حدود مصطنعة |
| سەربازی، سەروازی | العسكري |
| سیفەتی دەست بالاّ | الصفة الغالبة |
| سەرمایەی پارە | رأس المال النقدي |
| سەروەریی | السيادة |
| سەربەخۆیی | الاستقلال |
| سەردەکات | يتسرب، يتدفق |
| سفت | كثيف(للنسيج) |
| سەربەرەو دەریا | نحو البحر |
| سەرەتاتکێ | الاستطلاع |

## شـ

| | |
|---|---|
| شلەتێن | فاتر |
| شەوکەران | شجرة الشوكران |
| شارەزایی دۆخی هەوا | الانواء الجوية |
| شوێنکار | معالم، اثر |
| شێ ی رێژەیی | الرطوبة النسبية |
| شان لەشان | المزاحمة، المنافسة |
| شکستەنی | المواد القابلة للكسر |
| شمەکی بەرهەم ساز | السلع الانتاجية |
| شمەکی بەکاربردن | السلع الاستهلاكية |
| شاری قەلاْکار | مدينة محصنة(عسكرية) |
| شاری خێو(درنج) | مدينة الاشباح |
| شاری ملیۆن نشین | مدينة مليونية |
| شاش | متفرقة، غيركثيف |
| شەتاو | الشط، الماء الوفير |
| شارێگە | الطريق الرئيس |
| شکستکرد | الانكسارية |

## عـ

| | |
|---|---|
| عەماراو | خزانات المياه |

## قـ

| | |
|---|---|
| قۆلْ | جهة، ذراع |
| قالْبووەکان | المترسون، بلورات المتخصصون |
| قەلْەبالْغ، قەرەبالْغ | كثير النفوس |
| قاپوور، توێکلْ | درع، هيكل |
| قولاْیی بین | المسبلر |

## کـ

| | |
|---|---|
| کەندڕ | الجرف |
| کێشانە | |
| کۆتایی گەورە | النهاية العظمى |
| کۆتایی بچوك | النهاية الصغرى |
| کەمەرەی زەمین | خط الاستواء |
| کاژ | الصنوبر |
| کانی ئاگرین(ئاگرپژێن) | البركان |
| کووڕ | عالي، مقوس |
| کەنارەو کەنار | على امتداد الساحل |
| کەناراو | الساحل |
| کوختە، کونج | الكوخ |
| کۆمەڵی یەکان | الجماعية |
| کشتگە | مزرعة |
| کشتار | مزارع |

| | |
|---|---|
| کزن | البرسيم |
| کشتوکاڵی جێگۆڕکێ | الزراعة المتنقلة |
| کشتوکاڵی گوزەرەنکاری | الزراعة المعاشية |
| کلکار | الفخاري |
| کێشانە سووك | ذات الوزن الخفيف |
| کەلێن | المنفذ |
| کەرەتۆپەڵ | كتلة صماء |
| کارزانی | الكفاءة |
| کارزان | الكفؤ |

## گـ

| | |
|---|---|
| گۆڕاوەکان | المتحولة |
| گلکار | الطينية |
| گیانلەبەر، بێ زمان | الحيوانات |
| گەردونی | الفلكية |
| گڕە | السموم |
| گەلارێژ | نفضية |
| گەروو، تەنگە | المضيق |
| گەورەشار | المدينة الكبيرة |
| گیازەنگولە، گارس | الشوفان |
| گاسنکێش | جرارات المحاريث |
| گەرماگۆڕکێ | التغييرات الحرارية |
| گۆل گۆلکراو | مقسمة الى حقول |
| گەردوونەجێ | الموقع الفلكي |

## لـ

| | |
|---|---|
| لەلەکراو | مدرجة بخطوط |
| لادەدات | ينحرف |
| لقەقۆڵ | جهات فرعية |
| لەخۆزیاد | الفائض عن الحاجة |
| لەون، کارزان | كفؤ |
| لەون، کارزان | كفؤ |
| لێدەرهاتی نەوت | مستخلصات النفط |
| لمکار | رملي |
| لابەلا، لەلاوە | بصورة غير مباشرة |
| لوولەکێشی | مد الانابيب |

## مـ

| | |
|---|---|
| مرۆڤکرد، مرۆڤکار | من صنع الانسان |
| مۆلگە | المركز |
| مۆلگەی ناوچە | مركز الناحية |
| مۆلگەی بەڕێوەبراو | مركز اداري |
| مۆلگەی هەڵسوڕاو | مركز اداري |
| مێگەل | قطيع |
| مێگەلەشار | مدينة متجمعة |
| مێژووکرد | تاريخي |
| مت بوون | سبات |
| میزاودان | التسميد الحيواني (العضوي) |
| مۆلەتکار | مؤقت |

## نـ

| | |
|---|---|
| نیشتەنی جۆشکار | رسوبية لاحمة |
| نیشتەنی کردەکان | الرسوبية |
| نشینە، دانیشتوان | السكان |
| نەخشەی نشینە نماکان | الخرائط السكانية |
| نەخشەی مێژوونما | خريطة تأريخية |
| نخوونکراو | منكوس، مقلوب |
| نیمچە خولگە | شبه مداري |

| | |
|---|---|
| نیشتن | ترسب، هبوط |
| نیشتنی(داکەوتنی) هەوا | هبوط الهواء |
| ناچونیەکی | التباين |
| نەوە | السلالة |
| نایەتە پێوان (ناپێورێت) | غير قابل للقياس |
| نشینگە (ئاوایی) | مستقطنة |
| ئۆڕینی تایبەتکار | النظرة الخاصة (المتخصصة) |
| ناپێویست | الكماليات |
| ناوچەی پێ گواز | منطقة انتقالية |
| ناوەند | متوسط |
| ناتەوایی جیۆلۆجی | العيوب الجيولوجية |
| ناردەنی | صادرات |
| نەوتبەر | ناقلات النفط |
| ئۆرەی کشتوکاڵ | الدورة الزراعية |
| نیشتەنی | ترسبات |
| نەهەنگ | الحوت |
| نانەوە، هەڵبژاردن | اختيار |
| نیشانە | الاشارة، الهدف |

## هـ

| | |
|---|---|
| هەناسەدار | مسامي |
| هۆ | سبب |
| هەسارە | كوكب سيار |
| هەمەجۆر | متنوع |
| هێڵکرد | الخطي |
| هێڵکار | مخطط، تخطيط |
| هۆکار | المؤثر، تأثير |
| هەڵاوێردن | استثناء |
| هەڵدەوێردرێت | يستثنى |
| هەڵدێر | حافة الجرف |
| هەڵدەدێردرێت | ينحدر، يسقط |
| هەڵدێران | التدحرج، السقوط |
| هەڵمێن، هەڵمان | التبخر |
| هەڵسوڕاندن | الادارة |
| هەڵئاوسان | التضخم، الانتفاخ، التورم |
| هەرگیز | الدائم |
| هەڵقوڵان | الانبثاق، التدفق |
| هۆکاری خۆجێ | الاسباب (العوامل) المحلية |
| هەرەوەزی | التعاوني |
| هەرەس | المنحدر المنشق المائل للسقوط |
| هەرەسهێنان | الانهدام، انزلاق الارض |

# پێرست